زنجيرەی پەروەردەیی
(١٨)

# مەرجەکـانی پـاڕانــەوە
# و
# ڕێگرەکـانی وەڵامدانەوەی

## لە ژێر ڕۆشنایی قورئان و سوننەتدا

دانانی
سعید علی وهف القحطاني

وەرگێڕانی
حـەمـزە بـەرزنـجی

١٤٣٤ کۆچی - ٢٠١٣ زایینی

http://www.facebook.com/hamzabarzngy

ناوی کتێب/ مەرجەکانی پاڕانەوە و ڕێگرەکانی وەڵامدانەوەی لە ژێر ڕۆشانیی قورئان و سوننەتدا.

دانانی/ سعيد علی وهف القحطاني

وەرگێڕانی حەمزە بەرزنجی

تیراژ/ ١٠٠٠ دانە

نۆبەی چاپ/ یەکەم

ژمارەی سپاردن/ ژمارە (٢٠٢٣)ی ساڵی ٢٠٠٨ی زایینی پێ دراوە

بسم الله الرحمن الرحيم

(( إنَّ الحمدَ للهِ نَحمدهُ ونَستعينُهُ ونَستغفِرُهُ، ونَعوذُ باللهِ مِنْ شُرورِ أنفُسِنا ومن سيّئاتِ أعمالِنا، مَنْ يهدِهِ اللهُ فلا مُضلّ لَهُ، ومَنْ يُضلِلِ فَلا هاديَ لَهُ، وأشهَدُ أن لا إله إلا الله وحدَهُ لا شريكَ له، وأشهَدُ أنَّ محمّداً عَبدُهُ ورَسولهُ. صلى الله عليه وعلى آله وأصحابه ومن تبعهم بإحسان إلى يوم الدين وسلم تسليماً كثيراً. أما بعد:

**ئەم پەيامە كورتە سەبارەت بە مەرجەكانى پاڕانەوەو ڕێگرەكانى وەلاْمدانەوەيەتى كە لە كتێبى (الذكر والدعاء والعلاج بالرقى)[1]ى خۆم دەرم هێناوەو چەند زيادە سوودێكى گرنگم بۆ زياد كردووە كە موسڵمانان پێويستيان پێى دەبێت لە پاڕانەوەكانيدا. وە بەم شێوەيە خاڵبەندم كردووە:**

**بەشى يەكەم: چەمك(مفهوم)ى پاڕانەوەو جۆرەكانى.**

**بەشى دووەم: فەزڵى پاڕانەوە.**

**بەشى سىێيەم: مەرجەكانى پاڕانەوەو ڕێگرەكانى بەردەم وەلاْمدانەوەى.**

**بەشى چوارەم: ئادابەكانى پاڕانەوەو كات و شوێنەكانى وەلاْمدانەوەى.**

**بەشى پێنجەم: گرنگيدانى پێغەمبەران(ﷺ) بە پاڕانەوەو وەلاْمدانەوەى خواى گەورە بۆيان.**

**بەشى شەشەم: چەند پاڕانەوەيەكى گيرا.**

**بەشى حەوتەم: گرنگترين شتانێك كە بەندە داوا لە پەروەردگارى دەكات.**

**لە خواى پەروەردگار داواكارم كردەوەيەكى چاكى وەرگيراو بێت، سوودبەخش بێت بۆ خۆم و ئەو كەسەش كە دەيخوێنێتەوە هەر خۆى سەرپەرشت و تواناداره بەسەر ئەمەدا..**

وصلى الله وسلم وبارك على عبده ورسوله، وخيرته من خلقه، نبينا، وإمامنا، وقدوتنا، وحبيبنا، محمد بن عبد الله، وعلى آله، وأصحابه، ومن تبعهم بإحسان إلى يوم الدين.

دانەر/چێشتەهەنگاوى جومعە ١٤١٦/٦/١٧ى كۆچى

---

(١) من ص ١٨٦–١٢٣ نشر مكتبة الرشد بالرياض عام ١٤٠٧هـ.

# بەشی یەكەم: چەمكی پاڕانەوەو جۆرەكانی

## باسی یەكەم: چەمكی پاڕانەوە:

پاڕانـەوە لـە زمانەوانیـدا بـە مانـای (الطَّلَب والإبتِهال) داواكـردن و كڕوزانـەوە دێت، دەوترێت: (دعوتُ الله أدعوه دعاءً: ابتهلت إليه بالسؤال ورغبت فيما عنده من الخير) داوام لـە خـوا كـرد بـە داواكـردن، واتـە: بـە لالأنـەوە داوام لێ كـردو لـەو خێرەی كە هەیەتی بە ئومێد بووم.[1]

وە لە خوا پاڕایـەوە: واتـە داوای خێـری لێ كرد و ئومێـدی پـێ هـەبوو. وە بۆ فلأن پاڕایەوە: واتە داوای خێـری لـە خـوا بۆ كـرد، وە لـە فلأن پاڕایـەوە: واتـە داوای توشبوونی خراپەی لێ كرد.[2]

وەپاڕانـەوە بریتیـیـە لـە داواكردنـی بەنـدە لـە خـوای خـۆی لەسـەر شـێوەی كڕوزانەوە. وە ئەم ناوەش بە مەبەستی بە پاك ڕاگرتن و ستایش كردنی خوای گەورەو هاو وێنەكانی بەكاردەهێنرێت.[3]

پاڕانەوەش جۆرێكە لە جۆرەكانی زیكر، چونكە زیكر سێ جۆرە:

**جــۆری یەكــەم**: یـاد كردنـی خـوای گـەورە بـە نـاوو سیفەتەكانی و ماناكـانی و ستایش كردنی خوای گەورە پێیان، وە یەكخواناسی خـوا پێـی و پـاكڕاگرتنی لە هەرشتێك كە شایەنی خوای پەروەردگار نیە، ئەمیش بە هەمان شێوە دوو جۆرە:

-دارشتنی ستایش كردنەكەی كەسی زیكر خوێن بەو ناوو سیفەتانە، ئەمەش ئەو جۆرەیە كە لە فەرمودەدا باسكراوە وەك: (سبحان الله، والحمد لله، ولا إله إلا الله، والله أكبر).

---

(١) المصباح المنير ١/١٩٤.

(٢) المعجم الوسيط ١/٢٦٨.

(٣) القاموس الفقهي لغة واصطلاحاً ص ١٣١.

– باس کردنی خوای گەورە بە ناوو سیفەتەکانی وەك ئەوەی بڵێت: خوای گەورە بەسەر هەموو شتێکدا بە توانایە، وە ئەو زۆر شادومانترە بە گەڕانەوەی بەندەکەی لەو کەسەی وولاغەکەی وون بوو، وە ئەو دەنگی بەندەکان دەبیستێ و جوڵەکانیان دەبینێت و هیچ نهێنیەکی لێ وون نابێت، وە لە دایك و باوکیان بۆیان بەبەزەیی ترە.

**جۆری دووەم:** زیکری فەرمان و نەهیو حەڵاڵ و حەرام و ئەحکامەکانی، بەوەی کاربکات بە فەرمانەکانیو نەهیەکانی واز لێ بهێنێ، وە حەرام بە حەرام و حەڵاڵ بە حەڵاڵ بزانێ، ئەمیش دوو جۆرە:

–یادی خوای گەورە بکات بەوەی باسی بکات و بڵێت خوای گەورە فەرمانی کردووە بەوەو بەرگری کردووە لەوەو ئەوەی پێ خۆشەو ڕقی لەوەیەو لەوەش ڕازیە.

–یادی بکات لە کاتی فەرمانەکانیدا بەوەی هەستێت بە جێبەجێکردنی، وە لە کاتی نەهیەکانی لێی هەڵبێت و وازی لێ بهێنێت.

**جۆری سێیەم:** یاد کردنی نیعمەت و چاکەکانی خوای گەورە، ئەمیش لە گەورەترین جۆرەکانی زیکر کردنەو بەمەشەوە کردیە پێنج جۆر، ئەمیش بۆ خۆی سێ جۆرە:

–زیکرێك دڵ و زوبان تیایدا بەشدار بن، کە ئەمە پلە بەرزەکەیانە.

–زیکرێك تەنها بە دڵ بکرێت ئەویش لە پلەی دووەمدایە.

–زیکرێك تەنها بە زوبان بوترێت، ئەمیش لە پلەی سێیەمدایە.[1]

وە چەمکی زیکر: بریتیە لە ڕزگار بوون لە بێ ئاگابوون و لەبیرچوون. وە بێ ئاگایی(غەفڵەت): بریتیە لە واز هێنان لە شتێك بە ویستی مرۆڤ، لەبیرچوونیش/ وازهێنانە بە بێ ویست و دەستەڵات.

---

(١) مدارج السالكين لابن القيم ٢/٤٣٠ و٢٣/١، والوابل الصيب لابن القيم ص ١٧٨–١٨١.

**زیكریش سێ پلەی هەیە:**

**-زیكـری ڕووكـەش** (الظاهر)**: سـتایش كردنـی خـوای گەورەیـە وەك ووتنـی:** "سبحان الله والحمد لله ولا إله إلا الله والله أكبر".

**یان زیكری پاڕانەوەیە وەك:** ﴿قَالاَ رَبَّنَا ظَلَمْنَا أَنفُسَنَا وَإِن لَّمْ تَغْفِرْ لَنَا وَتَرْحَمْنَا لَنَكُونَنَّ مِنَ الْخَاسِرِينَ﴾.[1] **وە ووتنـی:** "يا حي يا قيوم برحمتك أستغيث". **وە هـاو شـێوەی ئەمانە.**

**-یان زیكری چاودێرییە**(رعایة)**: وەك ئەوەی كەسێك بڵێت: خوام لەگەڵە، خـوا تەماشام دەكات، خوا ئاگای لێمە. وە هاوشـێوەی ئـەو لەفزانـەی بەكاردێت بـۆ بـەهێز كردنـی لایـەنی بـەئاگایی مـرۆڤ لەگـەڵ خـوای گـەورەو وە چـاودێری بەرژەوەندییەكانی دڵی تێدایە. وە بۆ پاراستنی ئەدەبە لەگەڵ خـوای گـەورەو خۆپاراستنە لـە بـێ ئاگـابوون و پشـت بەسـتنە بـە خـوای گـەورە لـە شـەیتان و خراپەی نەفس.**

**وە ئـەو زیكرانـەی لـە پێغەمبـەرەوە(ﷺ) هـاتووە هەرسـێ جۆرەكـە لـە خـۆ دەگرێـت، چـونكە ستایشـی خـوای گـەوری تێدایـەو، پێكهـاتووە لـە پاڕانـەوەو داواكردن بە ڕاستەوخۆ یان ناڕاستەوخۆ. وە تەواوی چاودێری و بەرژەوەندی دڵ و خۆپارستن لە بێ ئاگا بوون لە خۆدەگرێت، وە پشت بەستنیشە بە خوای گەورە لە وەسوەسەكان و شەیتان.**

**زیكری شاراوە: ئـەمیش بریتییـە لـە زیكـر كردنـی خـوای گـەورە تـەنها بـە دڵ و ڕزگار بوون لە بێ ئاگاییو لەبیرچوون و ڕزگار بـوون لـە بەربەسـتی نێـوان دڵـی مـرۆڤ و خـوای پـەروەردگاریو بـەردەوام بـە ئاگاهێنانـەوەی دڵـە لەگـەڵ خـوادا، وەك ئەوەی كە خوای گەورە دەبینێت.**

---

(١) سورة الأعراف، الآية: ٢٣.

٣- **زیکـــری ڕاســـتەقینە:** بریتیەیــە لــە باسـکردنی بەنـدە لـە لایــەن خـوای پەروەردگارەوە.[(١)]

**خوای گەورە دەفەرموێت:** ﴿فَاذْكُرُونِي أَذْكُرْكُمْ وَاشْكُرُواْ لِي وَلاَ تَكْفُرُونِ﴾[(٢)].

**واتە:** (دەی کەواتە) ئەی ئیمانداران ئەگەر یادی من بکەن، منیش یادی ئێوە دەکەم و سوپاسگوزاری من بن و سوپاس ناپەزێرو سپڵەیی بەرامبەرم مەکەن.

**پێغەمبەری خوا(ﷺ) دەفەرموێت:** "يقول الله تعالى: أنا عند ظنّ عبدي بي، وأنا معه إذا ذكرني، فإن ذكرني في نفسه ذكرته في نفسي، وإن ذكرني في ملأٍ ذكرته في ملأٍ خيرٍ منهم، وإن تقرّب إليَّ شبراً تقرّبتُ إليه ذراعاً، وإن تقرّب إليَّ ذراعاً تقربتُ إليه باعاً، وإن أتاني يمشي أتيته هرولة".[(٣)]

**واتە:** خوای پەروەردگار دەفەرموێت: من لەگەڵ گومانی بەندەکەمدام بە من، وە منیش لەگەڵیدام کاتێ یادم دەکات، ئەگەر یادم بکات لە ناخی خۆیدا یادی دەکەم. وە ئەگەر لە ناو کۆمەڵێکدا یادم بکات ئەوا لە ناو کۆمەڵێکی لەوان باشتردا باسی دەکەم، وە ئەگەر بستێك لێم نزیك بێتەوە باڵێك نزیك دەبمەوە لێی، وە ئەگەر باڵێك لێم نزیك بێتەوە هەنگاوێك لێی نزیك دەبمەوە، وە ئەگەر بە ڕۆیشتنەوە بێت بەرەو ڕووم ئەوا بە هەروەلە دەچم بەرەو ڕووی.

---

(١) مدارج السالكين ٢/٤٣٤-٤٣٥.

(٢) سورة البقرة، الآية: ١٥٢.

(٣) البخاري واللفظ له برقم ٧٤٠٥، ومسلم ٢٠٦١/٤، برقم ٢٦٧٥، من حديث أبي هريرة (رضي الله عنه).

## باسی دووەم: جۆرەکانی پاڕانەوە:

**جۆری یەکەم: پاڕانەوەی پەرستش** (دُعاءُ العِبادة): **بریتی‌یە لە داواکردنی پاداشت بە کردەوە چاکەکان، وەك ووتنی شایەتومان و کارکردن بە مەرج و داواکاریی‌کانی، وە ئەنجامدانی نوێژو ڕۆژوو و زەکات و حەج و سەربڕین بۆ خوای گەورەو نەزر کردن بۆی، وە هەندێك لەم پەرستشانە پاڕانەوەی بە زمانی تێدایە لەگەڵ زمانی حاڵ، وەك نوێژ کردن. جا هەرکەسێك لەم پەرستشانەو غەیر ئەمانەی ئەنجامدا لە جۆرەکانی پەرستشە کرداری‌یەکان ئەوا لە خوای خۆی پاڕاوەتەوەو داوای لێ کردووە بە زمانی حاڵی کە لێی خۆش بێت.**

**بە کورتی خوای خۆی دەپەرستێت بە داواکردنی پاداشت و ترسان لە سزای. وە ئەم جۆرەش دروست نی‌یە بۆ غەیری خوای گەورە ئەنجام بدرێت. وە هەرکەسێك شتێکی لەمانە ئەنجامدا بۆ غەیری خوا ئەوا کوفری گەورەی ئەنجامداوە کە لە میللەتی ئیسلام دەری دەکات، وە بەر ووتەی خوای گەورە دەکەوێت کە دەفەرموێت:** [1] ﴿وَقَالَ رَبُّكُمُ ادْعُونِي أَسْتَجِبْ لَكُمْ إِنَّ الَّذِينَ يَسْتَكْبِرُونَ عَنْ عِبَادَتِي سَيَدْخُلُونَ جَهَنَّمَ دَاخِرِينَ﴾.[2]

**واتە: ئەی خەڵکینە پەروەردگارتان فەرموویەتی: ئێوە هاناو هاوار بۆمن بهێنن، ئەوە من دوعاو نزاتان گیرا دەکەم، بەڕاستی ئەوانەی خۆیان بەگەورە دادەنێن ولووت بەرزی دەکەن لەئاستی پەرستنی مندا، لەئاییندەدا بەسەرشۆڕی و خەجاڵەتی‌یەوە دەخرێنە ناو ئاگری دۆزەخەوە.**

---

(١) **بڕوانە**: فتح المجيد ص ١٨٠ والقول المفيد على كتاب التوحيد للعلامة ابن عثيمين ١/١١٧، وفتاوى ابن عثيمين ٦/٥٢.

(٢) سورة غافر، الآية: ٦٠.

وه فەرمویەتی: ﴿قُلْ إِنَّ صَلاَتِي وَنُسُكِي وَمَحْيَايَ وَمَمَاتِي لِلَّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ، لاَ شَرِيكَ لَهُ وَبِذَلِكَ أُمِرْتُ وَأَنَاْ أَوَّلُ الْمُسْلِمِينَ﴾[1].

واتە: (ئەی پێغەمبەر(ﷺ)، ئەی ئیماندار) بڵێ: بەڕاستی نوێژو حەج و دروشمەکانی و (سەرجەم چاکە و بەندایەتیم) هەروەها ژیان و مردنم تایبەتە بۆ خوای پەروەردگاری جیهانیانەوە. ئەو زاتە هیچ هاوەڵ و هاوبەش و شەریکێکی نیەو من بەوە فەرمانم پێدراوەو من یەکەم کەسی موسوڵمانانم.

**جۆری دووەم: پاڕانەوەی داواکردن** (دُعاءُ المَسألَة): ئەویش بریتییە لە داواکردنی کەسی داواکار بۆ هێنانی سودێك یان لابردنی خراپەیەك و داواکردنی پێویستییەکانی مرۆڤ. وە ئەم داواکردنەش ووردەکاریو درێژەی هەیە بەم جۆرە:

ئەگەر داواکردنەکە لە لایەن بەندەوە بۆ بەندەیەکی هاوشێوی خۆی لە دروستکراوان، وە لە شتێکدا بوو کە توانای ئەنجامدانی هەبوو، وە کەسەکە زیندوو و ئامادە بوو، ئەوا شیرك نییە، وەك ئەوەی داوای لێ بکات و بڵێیت: ئاوم بدەرێ، یان ئەی فلاَن خواردنم بدەرێ، یان هاووێنەی ئەمانە، ئەوا هیچی تێدا نییە.

بۆیە پێغەمبەری خوا(ﷺ) دەفەرموێت: "من سأل بالله فأعطوه، ومن استعاذ بالله فأعيذوه، ومن دعاكم فأجيبوه، ومن صنع إليكم معروفاً فكافئوه، فإن لم تجدوا ما تكافئونه فادعوا له حتى تروا أنكم قد كافأتموه".[2]

---

(١) سورة الأنعام، الآيتان: ١٦٢، ١٦٣.

(٢) أبو داود برقم ١٦٧٢، والنسائي ٨٢/٥، وأحمد في المسند ٦٨/٢، ٩٩، وانظر: التعليق المفيد على كتاب التوحيد لسماحة الشيخ العلامة ابن باز ص ٩١ وص ٢٤٥.

واتە: هەرکەسێك بە ناوی خوا داوای لێ کردن پێی بدەن، وە هەرکەسێك بە خوای گەورە پەنای بۆ هێنان پەنای بدەن. وە هەرکەسێك بانگی کردن وەڵامی بدەنەوە. وە هەرکەسێك چاکەی لەگەڵ کردن پاداشتی بکەن، خۆ ئەگەر هیچتان دەست نەکەوت بیدەنێ ئەوا بۆی بپاڕێنەوە تا وا دەزانن پاداشتان کردووە.

بەڵام ئەگەر داوا لە کەسێك بکات شتێکی بۆ جێبەجێ بکات کە تەنها لەتوانای خوای گەورەدایە ئەوا ئەم کەسە بەم کارە موشریك و کافر دەبێت، جا ئیتر داوا لێ کراوەکە زیندوو بێت یان مردوو. ئامادە بێت یان غائیب، وەك ئەوەی یەکێك بڵێت: (ئەی فلانە کەسی گەورەم نەخۆشیەکەم چاك بکەرەوە، کەسە دیار نەماوەکەم بۆ بگێڕەوە، کۆمەك و پشتیوانیم بکە، منداڵم پێ ببەخشە)، وە ئەم کارە کوفری گەورەیەو مرۆڤ لە میللەتی ئیسلام دەکاتە دەرەوە: خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَإِن يَمْسَسْكَ اللّهُ بِضُرٍّ فَلاَ كَاشِفَ لَهُ إِلاَّ هُوَ وَإِن يَمْسَسْكَ بِخَيْرٍ فَهُوَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدُير﴾.(١)

واتە: (دڵنیابە لەوەی) ئەگەر خوا دووچاری زیان و گرفتێکت بکات، ئەوە هەرگیز لابەری نیە جگە خۆی نەبێت، خۆ ئەگەر بیەوێت تووشی خێرو خۆشیەکت بکات، ئەوە ئەو خوایە دەسەڵاتی بەسەر هەموو شتێکدا هەیە.

وە دەفەرموێت: ﴿وَلاَ تَدْعُ مِن دُونِ اللَّهِ مَا لاَ يَنفَعُكَ وَلاَ يَضُرُّكَ فَإِن فَعَلْتَ فَإِنَّكَ إِذًا مِّنَ الظَّالِمِينَ، وَإِن يَمْسَسْكَ اللَّهُ بِضُرٍّ فَلاَ كَاشِفَ لَهُ إِلاَّ هُوَ وَإِن يُرِدْكَ بِخَيْرٍ فَلاَ رَآدَّ لِفَضْلِهِ يُصيبُ بِهِ مَن يَشَآءُ مِنْ عِبَادِهِ وَهُوَ الْغَفُورُ الرَّحِيمُ﴾.(٢)

واتە: هاناو هاواریش نەبەیت بۆ کەسێك یان شتێك لە جیاتی خوا، کە نە قازانجت پێ دەگەیەنێت نە زیان (چونکە قازانج و زیان هەر بەدەست خوایە)،

---

(١) سورة الأنعام، الآية: ١٧.

(٢) سورة يونس، الآيتان: ١٠٦، ١٠٧.

خۆ ئەگەر کاری وا ئەنجام بدەیت، ئەوە بەڕاستی تۆ لە ستەمکارانیت. (ئەی ئینسان) ئەگەر خوا تووشی ناخۆشی و زیانێکت بکات، ئەوە هیچ کەس ناتوانێت فریات بکەوێت و لەسەرتی لابەرێت جگە لەو زاتە، یاخود ئەگەر بیەوێت تووشی خێر و خۆشیەکت بکات، ئەوە هیچ کەس ناتوانێت بەری فەزڵ و بەخششی خوا بگرێت، هەر کام کە بیەوێت لە بەندەکانی بەهرەوەر دەکات (لە نازو نیعمەتانی بێ‌شومار) ئەو زاتە هەمیشە لێخۆشبوو میهرەبانە.

وە دەفەرموێت: ﴿إِنَّ الَّذِينَ تَدْعُونَ مِن دُونِ اللَّهِ عِبَادٌ أَمْثَالُكُمْ فَادْعُوهُمْ فَلْيَسْتَجِيبُواْ لَكُمْ إِن كُنتُمْ صَادِقِينَ﴾.(١)

واتە: بەڕاستی ئەوانەی ئێوە هاواریان لێدەکەن جگە لە خواو لێیان دەپاڕێنەوە، چەند بەندەیەکی وەك ئێوەن (هیچیان بەدەست نیە) دە هاواریان لێ بکەن، بابێن بەدەمتانەوە، ئەگەر ئێوە ڕاست دەکەن (لەو داوایەتاندا).

وە دەفەرموێت: ﴿وَالَّذِينَ تَدْعُونَ مِن دُونِهِ لاَ يَسْتَطِيعُونَ نَصْرَكُمْ وَلآ أَنفُسَهُمْ يَنصُرُونَ﴾.(٢)

واتە: ئەوانەی کە ئێوە جگە لە خوا هاناو هاواریان بۆ دەبەن ناتوانن سەرکەوتوتان بکەن، (تەنانەت) ناتوانن یارمەتی خۆیشیان بدەن.

وە دەفەرموێت: ﴿وَمِنَ النَّاسِ مَن يَعْبُدُ اللَّهَ عَلَى حَرْفٍ فَإِنْ أَصَابَهُ خَيْرٌ اطْمَأَنَّ بِهِ وَإِنْ أَصَابَتْهُ فِتْنَةٌ انقَلَبَ عَلَى وَجْهِهِ خَسِرَ الدُّنْيَا وَالآخِرَةَ ذَلِكَ هُوَ الْخُسْرَانُ الْمُبِينُ، يَدْعُواْ مِن دُونِ اللَّهِ مَا لا يَضُرُّهُ وَمَا لا يَنفَعُهُ ذَلِكَ هُوَ الضَّلالُ الْبَعِيدُ، يَدْعُواْ لَمَن ضَرُّهُ أَقْرَبُ مِن نَّفْعِهِ لَبِئْسَ الْمَوْلَى وَلَبِئْسَ الْعَشِيرُ﴾.(٣)

---

(١) سورة الأعراف، الآية: ١٩٤.

(٢) سورة الأعراف، الآية: ١٩٧.

(٣) سورة الحج، الآيات: ١١-١٣.

واتـه: هەنـدێك لـه خـەڵكی هەیـه تـەنها لـه یـەك حاڵەتـدا خواپەرسـتی دەكـات (ئەویش ئەو حاڵەتەیە كە دنیا بەدڵی ئەو بێت)، ئەگـەر تووشـی خێـرو خۆشـی بوو دڵی پێی خۆشە، خۆ ئەگەر تووشی تاقیكردنەوەیەك هات، سواری سـەری خۆی دەبێت و هەڵدەگەڕێتەوە، ئا بەو حاڵەتەی دنیا و قیامەت لە دەست خۆی دەدات و زەرەرمەندی هەردوو لایەو هەر ئەوەشـە خەسارەتمەندو زەرەرمەنـدی ڕوون و ئاشكرا. (ئـەو جـۆرە كەسـانە) هانـاو هـاوار لەكەسـێك دەكـەن لـەجیاتی خوا، یاخود پەنا بۆ كەسێك دەبـەن نـە زەرەرو نـە قـازانجی پێدەگەیـەنێت، ئـەو حاڵەتـە گـومڕایی و سەرلێشـێواویەكی زۆر نابـەجێ و دوورە. (نـەفامان هانـاو هـاوار) لەكەسـێك دەكـەن كـە زەرەری زیـاتر و نـزیكترە لـە قـازانجی، ئـای كـە چەندە یارو یاوەر و هاودەمێكی ناڕەسەن و خراپیان هەیە.

وە دەفەرموێت: ﴿يَآ أَيُّهَا النَّاسُ ضُرِبَ مَثَلٌ فَاسْتَمِعُواْ لَهُ إِنَّ الَّذِينَ تَدْعُونَ مِن دُونِ اللَّهِ لَن يَخْلُقُواْ ذُبَابًا وَلَوِ اجْتَمَعُواْ لَهُ وَإِن يَسْلُبْهُمُ الذُّبَابُ شَيْئًا لا يَسْتَنقِذُوهُ مِنْهُ ضَعُفَ الطَّالِبُ وَالْمَطْلُوبُ، مَا قَدَرُواْ اللَّهَ حَقَّ قَدْرِهِ إِنَّ اللَّهَ لَقَوِيٌّ عَزِيزٌ﴾.(١)

واته: ئەی خەڵكینە: نموونەیەك هێنراوەتـەوە چاك گـوێی بـۆ بگـرن: بەڕاسـتی ئەوانـەی كـە هانـاو هاواریـان لێدەكـەن لـەجیاتی خـوا، هـەرگیز نـاتوانن تاكـە مێشێك دروست بكەن، هەرچەندە بۆ ئەو كارە كۆببنـەوە و (یارمـەتی یـەكتریش بـدەن) و ئەگـەر مێشـەكە شـتێكیان لـێ بفڕێنێـت، نـاتوانن لێـی بسـەننەوە، داواكارو داوالێكراو هەردووكیان لاواز و بێ دەسەڵاتن.

وە دەفەرموێت: ﴿مَثَلُ الَّذِينَ اتَّخَذُواْ مِن دُونِ اللَّهِ أَوْلِيَاءَ كَمَثَلِ الْعَنكَبُوتِ اتَّخَذَتْ بَيْتًا وَإِنَّ أَوْهَنَ الْبُيُوتِ لَبَيْتُ الْعَنكَبُوتِ لَوْ كَانُواْ يَعْلَمُونَ، إِنَّ اللَّهَ يَعْلَمُ مَا يَدْعُونَ مِن دُونِهِ مِن شَيْءٍ وَهُوَ الْعَزِيزُ الْحَكِيمُ، وَتِلْكَ الأَمْثَالُ نَضْرِبُهَا لِلنَّاسِ وَمَا يَعْقِلُهَآ إِلا الْعَالِمُونَ﴾.(٢)

---

(١) سورة الحج، الآيتان: ٧٣-٧٤.

(٢) سورة العنكبوت، الآيات: ٤١-٤٣.

واتە: نمونەی ئەوانەی جگە لە خوای گەورە، کەسانێکی تر دەکەنە پشتیوانی خۆیان، وەك نمونەی جاڵجاڵۆکەیەك وایە کە ماڵێکی بۆخۆی سازکردبێت بەڕاستی لاوازترینی هەموو ماڵەکان ماڵی جاڵجاڵۆکەیە ئەگەر سەرنجیان بدایە و تێبگەیشتنایە ( چونکە ماڵی جاڵجاڵۆکە نە بناغە و نە دیواری هەیە، نە سەرو دەرگا و پەنجەرە، نە دەتوانێت بەرگەی با و باران و ڕوداوەکان بگرێت مێیەکەش نێرەکە لە ناو دەبات دوای جووت بوون، پاشان بێچوەکانیش دایکیان لە ناو دەبەن!!!).

بێگومان خوای گەورە خۆی چاکدەزانێت ئەوەی ئەو خەڵکە هاناو هاواری بۆ دەبەن لە جیاتی ئەو چەندە بێ دەسەڵاتن، چونکە هەر خۆی خاوەن دەسەڵاتە و زۆریش دانایە (لەو بوارەی کە بۆ تاقیکردنەوەی خەڵکی ڕەخساندویەتی).

ئا ئەم نمونانە ئێمە دەیهێنینەوە بۆ خەڵکی، تەنها زانا و شارەزاکان تێی دەگەن و تێ دەفکرن.

وە دەفەرموێت: ﴿قُلِ ادْعُواْ الَّذِينَ زَعَمْتُم مِّن دُونِ اللَّهِ لا يَمْلِكُونَ مِثْقَالَ ذَرَّةٍ فِي السَّمَاوَاتِ وَلا فِي الأَرْضِ وَمَا لَهُمْ فِيهِمَا مِن شِرْكٍ وَمَا لَهُ مِنْهُم مِّن ظَهِيرٍ، وَلا تَنفَعُ الشَّفَاعَةُ عِندَهُ إِلا لِمَنْ أَذِنَ لَهُ حَتَّى إِذَا فُزِّعَ عَن قُلُوبِهِمْ قَالُواْ مَاذَا قَالَ رَبُّكُمْ قَالُواْ الْحَقَّ وَهُوَ الْعَلِيُّ الْكَبِيرُ﴾.[١]

واتە: (ئەی پێغەمبەر(ﷺ) بە هاوەڵپەرستان) بڵێ: با هاناو هاوار ببەن بۆ ئەو شتانەی کە لەجیاتی خوا (دەیانپەرستن)!! (ئەوانە) خاوەنی بچوکتر لە ئەتۆمێك نین نە لە ئاسمانەکان، نە لە زەویدا، وەهیچ هاوبەشی و هاوکاریەکیشیان نیە تیایاندا، دەسەڵاتی هیچ پشتیوانی و یارمەتیەکیشیان نیە. هیچ تکاو پاڕانەوەیەك سودی نیە لای (خوا) مەگەر خۆی مۆڵەت بدات

(١) سورة سبأ، الآيتان: ٢٢، ٢٣.

هەتا ئەو کاتەی ئیتر (ئەوانەی تکاکارن و ئەوانەش کە تکایان بۆ دەکرێت دڵیان دێتەوە جیٚ و هۆشیان پیادێتەوە و لەیەکتر دەپرسن): پەروەردگارتان فەرمانی بەچی داو چی فەرموو: (لە وەڵامیاندا) دەڵێن: حەق و ڕاست و دروست، بەڕاستی ئەو (پەروەردگارە) زۆر بەرزو بڵندو گەورەیە.

وە دەفەرمویٚت: ﴿.......ذَلِكُمُ اللَّهُ رَبُّكُمْ لَهُ الْمُلْكُ وَالَّذِينَ تَدْعُونَ مِن دُونِهِ مَا يَمْلِكُونَ مِن قِطْمِيرٍ، إِن تَدْعُوهُمْ لا يَسْمَعُواْ دُعَاءَكُمْ وَلَوْ سَمِعُواْ مَا اسْتَجَابُواْ لَكُمْ وَيَوْمَ الْقِيَامَةِ يَكْفُرُونَ بِشِرْكِكُمْ وَلا يُنَبِّئُكَ مِثْلُ خَبِيرٍ﴾.[1]

واتە: ئا ئەو خوایە پەروەردگارتانە خاوەنی هەموو موڵك و بەدیهاتووەکانە، (بەڵام) ئەوانەی جگە لەو هاناو هاواری بۆ دەبەن ولیٚی دەپاڕێنەوە تەنانەت خاوەنی توێکڵە تەنکەکەی دەوری ناوکی خورمانیش نین. خۆ ئەگەر هاناو هاواریان بۆ بەرن گوێیان لیٚتان نییە و نابیستن، ئەگەر بشبیستن بە دەمتانەوە نایە، ڕۆژی قیامەتیش حاشا دەکەن لیٚتان و لەوەی کە بە (خواتان) زانیوون، بیٚگومان کەس نییە وەك (خوا) ئاگاو زانا بێت و هەواڵی ڕاست و دروست بگەیەنیت.

وە دەفەرمویٚت: ﴿وَمَنْ أَضَلُّ مِمَّن يَدْعُواْ مِن دُونِ اللَّهِ مَن لا يَسْتَجِيبُ لَهُ إِلَى يَومِ الْقِيَامَةِ وَهُمْ عَن دُعَآئِهِمْ غَافِلُونَ، وَإِذَا حُشِرَ النَّاسُ كَانُواْ لَهُمْ أَعْدَآء وَكَانُواْ بِعِبَادَتِهِمْ كَافِرِينَ﴾.[2]

واتە: جا ئیتر کیٚ لەو کەسە گومڕاترە کە دوعاو نزا و پاڕانەوە ڕوو بەکەسیٚك یان شتیٚك دەکات جگە لەخوا کە ئەگەر هەتا ڕۆژی قیامەتیش لیٚی بپاڕێتەوە بیٚ سوودە، نەبەهانایەوە دەچیٚت نە بە پەرستنەکەش دەزانیٚت، لەکاتیٚکدا ئەوانە لە دۆعاو پارانەوەی ئەوان بیٚ ئاگاو غافڵن و هەستی پیٚ ناکەن. کاتیٚکیش کەخەڵکی کۆدەکریٚنەوە بۆ لیٚپرسینەوە، بت و پەرستراوەکان دەبنە

---

(١) سورة فاطر، الآيتان: ١٣، ١٤.

(٢) سورة الأحقاف، الآيتان: ٥، ٦.

دوژمن بۆ ئەو کەسانە کە لەدونیادا دەیانپەرستن، بەهیچ شێوەیەك بڕوایان پێ ناکەن، بەڵکو بەدرۆیان دەخەنەوە.

وە هەرکەسێك هاناو هاوار لە غەیری خوا ببات یان بە پاڕانەوەی پەرستش یان داواکردن لە غەیری خوا داوا بکات و بپاڕێتەوە لە شتێکدا کە جگە لە خوای گەورە توانای جێبەجێ کردنی نەبێت: ئەوا ئەو کەسە موشریك و مورتەد دەبێت، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿لَقَدْ كَفَرَ الَّذِينَ قَالُواْ إِنَّ اللَّهَ هُوَ الْمَسِيحُ ابْنُ مَرْيَمَ وَقَالَ الْمَسِيحُ يَا بَنِي إِسْرَآئِيلَ اعْبُدُواْ اللَّهَ رَبِّي وَرَبَّكُمْ إِنَّهُ مَن يُشْرِكْ بِاللَّهِ فَقَدْ حَرَّمَ اللَّهُ عَلَيْهِ الْجَنَّةَ وَمَأْوَاهُ النَّارُ وَمَا لِلظَّالِمِينَ مِنْ أَنصَارٍ﴾.(١)

واتە: سوێند بەخوا بەڕاستی ئەوانە بێ باوەڕ بوون کە وتیان: خوا هەر مەسیحی کوڕی مەریەمە (بەمەرجێك) مەسیح وتوویەتی: ئەی نەوەی ئیسرائیل، ئەو خوایە بپەرستن کە پەروەردگاری من و پەروەردگاری ئێوەشە و دڵنیابن ئەوەی شەریك و هاوبەش بۆ خوا بڕیار بدات، ئەوە بێگومان خوا بەهەشتی لەسەر حەرامکردووە و شوێن و جێگاو سەرەنجامی ئاگرە، ئەوسا ئەوستەمکارانە هیچ جۆرە پشتیوانێکیان نی یە (کەس ناتوانێت فریایان بکەوێت).

وە دەفەرموێت: ﴿إِنَّ اللَّهَ لاَ يَغْفِرُ أَن يُشْرَكَ بِهِ وَيَغْفِرُ مَا دُونَ ذَلِكَ لِمَن يَشَآءُ وَمَن يُشْرِكْ بِاللَّهِ فَقَدْ ضَلَّ ضَلاَلاً بَعِيدًا﴾.(٢)

واتە: بەڕاستی خوا خۆش نابێت لەوە هاوەڵ و شەریکی بۆ بڕیار بدرێت و جگە لەو (هاوبەش دانانە) لە گوناهانی تر بۆ هەر کەس بیەوێت و شایستە بێت و (پەشیمان بێت) خۆش دەبێت، جا ئەوەی شەریك و هاوەڵ بۆ خوا بڕیار بدات، ئەوە بەڕاستی گومڕا بووە بەگومڕاییەکی زۆر دوور.

---

(١) سورة المائدة، الآية: ٧٢.

(٢) سورة النساء، الآية: ١١٦، وفي آية ٤٨ [فَقَدِ افْتَرَى إِثْمًا عَظِيمًا].

وه دەفەرموێت: ﴿فَلا تَدْعُ مَعَ اللَّهِ إِلَهًا آخَرَ فَتَكُونَ مِنَ الْمُعَذَّبِينَ﴾.[1]

واتە: کەواتە ئەی ئیمانداران، لەگەڵ خوادا هانا و هاوار بۆ بەناو خوایەکی تر مەبە، چونکە بەهۆی ئەوەوە تۆش لە سزا دراوان دەبیت.

وه دەفەرموێت: ﴿وَلَقَدْ أُوحِيَ إِلَيْكَ وَإِلَى الَّذِينَ مِن قَبْلِكَ لَئِنْ أَشْرَكْتَ لَيَحْبَطَنَّ عَمَلُكَ وَلَتَكُونَنَّ مِنَ الْخَاسِرِينَ، بَلِ اللَّهَ فَاعْبُدْ وَكُن مِّنَ الشَّاكِرِينَ﴾.[2]

واتە: سوێند بەخوا با دڵنیابن کە وەحی و نیگا نێردراوە بۆ تۆو بۆ ئەوانەی پێش تۆش: ئەگەر هاوەڵگەر بیت و شەریك بۆ خوا بڕیار بدەیت کاروکردەوە چاکەکانیشت پووچە و دەچیتە ڕیزی خەسارەتمەند و زەرەرمەندانەوە. نەخێر بەگوێیان مەکە، کەواتە هەر تەنها خوا بپەرستە و لە دەستەی سوپاسگوزاران بە.

وه دەفەرموێت: ﴿.....وَلَوْ أَشْرَكُواْ لَحَبِطَ عَنْهُم مَّا كَانُواْ يَعْمَلُونَ﴾.[3]

واتە: خۆ ئەگەر شەریك و هاوبەش بڕیار بدەن، ئەوە هەرچی کارو کردەوەیەکی (چاکیشیان) هەیە هەمووی پووچ و بێ نرخ دەبێت.

## جیاوازی لە نێوان داوای فریاکەوتن(الإستِغاثَة) و پاڕانەوە(الدُّعاء):

(١) سورة الشعراء، الآية: ٢١٣.

(٢) سورة الزمر، الآيتان: ٦٥، ٦٦.

(٣) سورة الأنعام، الآية: ٨٨.

الإستغاثة: واتە داواکردنی بە هاناوە هاتن، کە ئەویش لابردنی نارەحەتی‌یەکە وەك (الإستِنصار): واتا داواکردنی سەرخستن، وە (الإستغاثة)ش: بریتیی‌یە لە داواکردنی پشتیوانی.

کەواتە جیاوازی نێوان (الإستغاثة) وپاڕانەوە ئەمەیە:

الإستغاثة: تەنها بۆ کەسێکە کە لە نارەحەتیدا بێت، بەڵام پاڕانەوە فراوانترە بۆ کەسی نارەحەت و غەیری ئەویشە، جا ئەگەر بە دوای دوعادا (الإستغاثة) هێنرا ئەوا لە بابی هێنانی گشتی‌یە لەسەر تایبەت، لەنێوانیاندا گشتی‌و تایبەت هەیەو لە شتێکدا یەکدەگرنەوە، دوعاش لە شتێکی تردا لەو جیاوازە، کەواتە هەموو (الإستغاثة)یەك پاڕانەوەیە، بەڵام هەموو پاڕانەوەیەك (الإستغاثة) نی‌یە.

وە پاڕانەوەی داواکردن پاڕانەوەی پەرستشی تێدایە، وە پاڕانەوەی پەرستشیش پاڕانەوەی داواکردنی لەخۆ گرتووە، جا ووشەی (الدعاء) لە قورئاندا هەندێك کات مەبەست پێی پاڕانەوەی عیبادەتە، وە هەندێك کات پاڕانەوەی داواکردنە، وە هەندێك کاتی تریش مەبەست پێی هەردووکیانە.(١)

## بەشی دووەم: فەزڵ و گەورەیی دوعاو پاڕانەوە:

(١) بڕوانە: فتح المجيد ص ١٨٠.

له باسی گەورەیی پاڕانەوەدا کۆمەڵێك ئایەت و فەرمودەی زۆر هاتووە لەوانە:

١ . خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَإِذَا سَأَلَكَ عِبَادِي عَنِّي فَإِنِّي قَرِيبٌ أُجِيبُ دَعْوَةَ الدَّاعِ إِذَا دَعَانِ فَلْيَسْتَجِيبُواْ لِي وَلْيُؤْمِنُواْ بِي لَعَلَّهُمْ يَرْشُدُونَ﴾.(١)

واتە: (ئەی محمد(ﷺ) ئەگەر بەندەکانم پرسیارت لێبکەن دەربارەم، ئەوە من نزیکم لێیانەوە، بە هاناو هاواری دۆعا گۆیانەوە دەچم هەر کاتێك لێم بپاڕێنەوەو نزا بکەن، دەبا ئەوانیش بەدەم بانگەوازی منەوە بێن و باوەڕی دامەزراو بە من بهێنن، بۆ ئەوەی ڕێگای هۆشیاری و ئاگایی بگرنەبەر (بۆ بەدەستهێنانی سەربەرزی و سەرفرازی هەردوو جیهان).

٢ . وە دەفەرموێت: ﴿وَقَالَ رَبُّكُمُ ادْعُونِي أَسْتَجِبْ لَكُمْ إِنَّ الَّذِينَ يَسْتَكْبِرُونَ عَنْ عِبَادَتِي سَيَدْخُلُونَ جَهَنَّمَ دَاخِرِينَ﴾.(٢)

واتە: ئەی خەڵکینە پەروەردگارتان فەرموویەتی: ئێوە هاناو هاوار بۆمن بهێنن، ئەوە من دوعاو نزاتان گیرا دەکەم، بەڕاستی ئەوانەی خۆیان بەگەورە دادەنێن ولووت بەرزی دەکەن لەئاستی پەرستنی مندا، لەئاییندەدا بەسەرشۆڕی و خەجاڵەتی یەوە دەخرێنە ناو ئاگری دۆزەخەوە.

٣ . وە دەفەرموێت: ﴿ادْعُواْ رَبَّكُمْ تَضَرُّعًا وَخُفْيَةً إِنَّهُ لاَ يُحِبُّ الْمُعْتَدِين، وَلاَ تُفْسِدُواْ فِي الأَرْضِ بَعْدَ إِصْلاَحِهَا وَادْعُوهُ خَوْفًا وَطَمَعًا إِنَّ رَحْمَتَ اللَّهِ قَرِيبٌ مِّنَ الْمُحْسِنِينَ﴾.(٣)

واتە: هاناو هاوار بکەن لە پەروەردگارتان بەپاڕانەوەی بەکوڵ، بەنهێنی (لەکات و شوێنی لەباردا) چونکە بەڕاستی ئەو زاتە دەست درێژکارانی خۆش

---

(١) سورة البقرة، الآية: ١٨٦.

(٢) سورة غافر، الآية: ٦٠.

(٣) سورة الأعراف، الآيتان: ٥٥، ٥٦.

ناوێت (مەبەست ئەوانەن کە هاناو هاوار بۆ غەیری خوا دەبەن). (خەڵکینە فەساد و گوناه و تاوان ئەنجام مەدەن لە زەویدا دوای ئەوەی چاکەکاریی ڕەنگی گرتووەو (خەڵکی خەریکن خووی پێوە دەگرن))، بەردەوام هاناو هاوار بۆ خوا بەرن لە ترسی سزای دۆزەخ و بەئومێدی بەدەستهێنانی بەهەشت، بەڕاستی ڕەحمەتی خوا نزیکە لە چاکەکاران و چاکەخوازانەوە.

٤ . وە دەفەرموێت: ﴿ فَادْعُواْ اللَّهَ مُخْلِصِينَ لَهُ الدِّينَ وَلَوْ كَرِهَ الْكَافِرُونَ ﴾.[١]

واتە: کەواتە ئەی ئیمانداران: ئێوە هەر هانا و هاوار بۆ خوا بەرن و ملکەچ و فەرمانبەرداری ئاین و بەرنامەکەی ئەو بن، ئەگەر چی کافرو بێ بڕواکان پێی سەغڵەت بن و پێیان ناخۆش بێت.

٥ . وە دەفەرموێت: ﴿ هُوَ الْحَيُّ لا إِلَهَ إِلاَّ هُوَ فَادْعُوهُ مُخْلِصِينَ لَهُ الدِّينَ الْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ﴾.[٢]

واتە: ئەو زاتە هەمیشە و بەردەوام هەر زیندووە، جگە لەو پەرستراوێکی بەحەقی تر نیە، کەوابوو هانا و هاوار و نزاتان ڕوو بەو بێت، ملکەچ و فەرمانبەرداری بەرنامەو ئاینەکەی ئەو بن، سوپاس و ستایش بۆ خوا، کە پەروەردگاری هەموو جیهانیانە.

٦ . وعن النعمان بن بشير(رضي الله عنه) عن النبي(ﷺ) قال: "الدُّعاءُ هوَ العبادةُ". وقرأ: ﴿وَقَالَ رَبُّكُمُ ادْعُونِي أَسْتَجِبْ لَكُمْ إِنَّ الَّذِينَ يَسْتَكْبِرُونَ عَنْ عِبَادَتِي سَيَدْخُلُونَ جَهَنَّمَ دَاخِرِينَ ﴾.[١]

---

(١) سورة غافر، الآية: ١٤.

(٢) سورة غافر، الآية: ٦٥.

واته: پاڕانەوە پەرستشە، پاشان ئەم ئایەتەی خوێندەوە: ﴿وَقَالَ رَبُّكُمُ ادْعُونِي أَسْتَجِبْ لَكُمْ إِنَّ الَّذِينَ يَسْتَكْبِرُونَ عَنْ عِبَادَتِي سَيَدْخُلُونَ جَهَنَّمَ دَاخِرِينَ ﴾

٧ . وعن أبي هريرة(رضي الله عنه) عن النبي(ﷺ) قال: "ليس شيءٌ أكرَمَ على الله تعالى من الدعاء".(٢)

واتە: شتێك نىيە لەلاى خواى گەورە بەڕێزتر بێت لە پاڕانەوە.

٨ . وعن أبي هريرة(رضي الله عنه) قال: قال النبي(ﷺ) قال: "منْ لم يَسألِ الله يَغْضَبْ عليهِ".(٣)

واتە: ئەوەى داوا لە خوا نەكات و لێى نەپاڕێتەوە لێى تووڕە دەبێت.

شاعيريش دەڵێت:

لا تَسأَلنَّ بُنَيَّ آدم حاجةً وسلِ الذي أبوابه لا تحجبُ
اللّهُ يغضبُ إن تركت سؤاله وبُنيَّ آدم حين يُسأل يغضبُ

واتە: داواى پێويستيت لە نەوەى ئادەم مەكە، داوا لەو خوايە بكە كە دەرگاكانى داناخرێن، خواى گەورە تووڕە دەبێت ئەگەر داواى لێ نەكەيت، بەڵام نەوەى ئادەم كاتێ داواى لێ دەكەيت توڕە دەبێت.

---

(١) أبو داود ٢/٧٧، برقم ١٤٧٩، والترمذي ٥/٢١١ برقم ٢٩٦٩، وابن ماجه ٢/١٢٥٨، والبغوي في شرح السنة٥/١٨٤، وانظر: صحيح الجامع الصغير ٣/١٥٠ برقم ٣٤٠١، وصححه الشيخ محمد ناصر الدين الألباني في صحيح الترمذي ١/١٣٨.

(٢) الترمذي ٥/٤٥٦، برقم ٣٣٧٣، وابن ماجه ٢/١٢٥٨، وأحمد ٢/٤٤٢، وحسن إسناده الألباني في صحيح الترمذي ٣/١٣٨.

(٣) أحمد في المسند ٣/١٨، وفي الترمذي عن جابر بن عبد الله برقم ٣٣٨١، وعن عبادة بن الصامت برقم ٣٥٧٣، وحسنهما الألباني في صحيح الترمذي ٣/١٤٠، ١٨١.

٩ . وعن أبي سعيد(رضي الله عنه) أن النبي(ﷺ) قال: "ما من مسلم يدعو الله بدعوةٍ ليس فيها إثمٌ ولا قطيعةُ رحم إلا أعطاه الله بها إحدى ثلاث: إما أن تعجل له دعوته، وإما أن يدخرها له في الآخرة، وإما أن يصرف عنه من السوء مثلها". قالوا: إذاً نكثر. قال: "الله أكثر".(١)

واتە: هیچ موسڵمانێك نىیە كە بپاڕێتەوە لەخوای گەورە بە داواكاری‌یەك كە تاوان‌و پچڕاندنی ڕەحم نەبێت ئیلا خوای گەورە یەكێك لەم سێ شتەی دەداتێ:

١- یان پاڕانەوەكەی بۆ پێش دەخات‌و گیرا دەبێت.

٢- یان بۆی هەڵدەگرێ بۆ پاداشتی قیامەت.

٣- یان بەئەندازەی پاڕانەوەكەی خراپەو بەلاًی لێدوور دەخاتەوە. وتیان: كەواتە زۆر دەپاڕێینەوە. ئەویش فەرمووی: خوای گەورە زۆرتر پاداشتتان پێدەبەخشێ.

١٠ . وعن سلمان الفارسي(رضي الله عنه) قال: قال رسول الله(ﷺ): "إنَّ ربَّكُم تبارك وتعالى حييٌّ كَرِيمٌ يستَحي مِنْ عبدهِ إذا رفع يديه إليه أن يردَّهما صِفراً".(٢)

واتە: پەروەردگاری پاك و بەرزی ئێوە بەشەرم و بەخشندەیە شەرمی لێ دێت كاتێك بەندەیەكی هەردوو دەستی بۆ بەرزبكاتەوە و بپاڕێتەوە كە بەبێ ئومێدی و بە بەتاڵی بیگەڕێنێتەوە.

وە پاڕانەوە لە بەهێزترین هۆكارەكانی لاچوونی ناڕەحەتی‌و بەدەست هاتنی داواكاری‌یەكانە، وە بەسوودترین دەرمان و چارەسەرەو دوژمنی بەلاًیە، پاڵی پێوە دەنێ‌و ڕێی لێ دەگرێت نایەڵێت دابەزێت و دەیگەڕێنێتەوە، یان ئەگەر

(١) الترمذي ٥/٥٦٦ و ٥/٤٦٢ وأحمد ٣/١٨ وانظر صحيح الجامع ٥/١١٦ وصحيح الترمذي ٣/١٤٠.

(٢) أبو داود ٢/٧٨ برقم ١٤٨٨، والترمذي ٥/٥٥٧، وابن ماجه ٢/١٢٧١، والبغوي في شرح السنة ٥/١٨٥، وصححه الألباني في صحيح الترمذي ٣/١٧٩ وصحيح ابن ماجه برقم ٣٨٦٥.

دابەزی کەمی دەکاتەوە. وە چەکی بڕوادارە، وە دوعا لەگەڵ بەڵاو مەسیبەتدا سێ پلەی هەیە:

١- ئەگەر پاڕانەوەکە بەهێزتر بوو لە بەڵاکە بەرەنگاری دەبێت و نایهێڵێت.

٢-ئەگەر لاوازتر بوو لە بەڵاکە ئەوا بەڵاکە زاڵ دەبێت بەسەریداو تووشی بەندەکە دەبێت بەڵام کەمی دەکاتەوە ئەگەرچی لاوازیش بێت.

٣- یان بەرەنگاریی یەك دەبن و هەریەکەیان ڕێ لەوی تر دەگرێت.(١)

وعن ابن عمر(رضي الله عنهما) عن النبي(ﷺ) قال: "الدعاء ينفع مما نزل ومما لم ينزل فعليكم عباد الله بالدعاء".(٢)

واتە: پاڕانەوە سوودی هەیە بۆ ئەو بەڵایانەی کە دابەزیووەو ئەوەشی کە دانەبەزیووە، دە سا ئەی بەندەکانی خوا بپاڕێنەوە.

وعن سلمان(رضي الله عنه) قال: قال رسول الله(ﷺ): "لا يردُّ القضاء إلا الدعاء، ولا يزيد في العُمرِ إلا البر".(٣)

واتە: هیچ شتێك قەزای خوای گەورە ناگەڕێنێتەوە جگە لە پاڕانەوە، وە هیچ شتێك تەمەن زیاد ناکات جگە لە چاکە.

## بەشی سێیەم: مەرجەکانی پاڕانەوەو ڕێگرەکانی وەڵامدانەوەی

---

(١) الجواب الكافي للإمام ابن القيم ص٢٢، ٢٣، ٢٤. نشر مكتبة دار التراث ١٤٠٨هـ الطبعة الأولى، وطبع دار الكتاب العربي، ط٢، ١٤٠٧هـ ص٢٥، وطبع دار الكتب العلمية ببيروت، ص٤، وهي طبعة قديمة بدون تاريخ.

(٢) الحاكم ٤٩٣/١، وأحمد ٢٣٤/٥ وحسنه الألباني في صحيح الجامع ١٥١/٣ برقم ٣٤٠٢.

(٣) الترمذي بلفظه برقم ٢٢٣٩، والحاكم بنحوه ٤٩٣/١ من حديث ثوبان وصححه، ووافقه الذهبي، وحسنه الترمذي ٢٢٥/٢، لشاهده من حديث ثوبان عند الحاكم كما تقدم، وعند ابن ماجه برقم ٤٠٢٢، وأحمد ٢٧٧/٥.

ئیبن القیم(ڕەحمەتی خوای لێ بێت) فەرمویەتی: "الأدعية والتعوذات بمنزلة السلاح، والسلاحُ بضاربه، لا بحده فقط، فمتى كان السلاحُ سلاحاً تامّاً لا آفة به، والساعدُ ساعداً قوياً، والمانعُ مفقوداً، حصلت به النكاية في العدو، ومتى تخلَّف واحدٌ من هذه الثلاثة تخلَّف التأثير، فإن كان الدعاءُ في نفسه غير صالح، أو الداعي لم يجمع بين قلبه ولسانه، أو كان ثَمَّ مانعٌ من الإجابة، لم يحصل التأثير"(١)

واتە: پاڕانەوەو پەناگرتنەکان وەك چەك وان، وە چەکیش بە وەشێنەرەکەیەتی، نەك تەنها بە کاریگەری خۆی، جا هەرکات چەك توندوتۆڵ و بێ گرفت بوو وە باسکی وەشێنەرەکەشی بەهێز بوو، وە ڕێگریش نەبوو لە بەردەمیدا، ئەوکات کاری خۆی لە دوژمن دەکات، وە هەرکات یەکێك لەم سێ خاڵە نەما کاریگەریشی نامێنێت، جا ئەگەر پاڕانەوەکە لە خۆیدا تەواو چاك نەبوو، یان کەسەکە بە دڵ و زمان نەپاڕایەوە، یان ڕێگرێك هەبوو لە وەڵامدانەوەی، ئەو کات کاریگەری نابێت.

ئێستاش مەرجەکانی پاڕانەوەو ڕێگرەکانی وەڵامدانەوەی لەم دوو باسەدا دەخەمە ڕوو:

## باسی یەکەم: مەرجەکانی پاڕانەوە (شُروطُ الدُّعاء):

(١) الجواب الكافي لمن سأل عن الدواء الشافي للإمام ابن القيم رحمه الله تعالى ص٣٦ دار الكتاب العربي الطبعة الأولى ١٤٠٧هـ.

(الشَّرط): **له زمانەوانیدا واتە: نیشانە، وە لە شەرعدا:** (ما يلزم من عدمه العدم ولا يلزم من وجوده وجود، ولا عدم لذاته).[1] **واتە: بریتییە لەوەی لە نەهاتنەدی و نەبوونیدا نەبوون(و نادروستی عیبادەتەکە) دێتە کایەوە، بەڵام بە بوون و هاتنە دی (ئەو بەتەنها لە عیبادەتەکەدا) بوون(و تەواوی) یان نەبوون نایەتە کایەوە.**

**لە گەورەترین و گرنگترین مەرجەکانی قبولْ بوونی پاڕانەوە ئەمانەیە:**

**مەرجی یەکەم: نییەت پاکی(الإخلاص): بریتییە لە پاککردنەوەی پاڕانەوەو کردەوەکەت لە هەرشتێك کە بیشێوێنێت و ناشیرینی بکات، وە ئەنجامدانی تەنها لەبەر خاتری خوای گەورە بێت بەبێ هاوەڵ دانان وە بەبێ ریاو بەرچاوێنی، وە بەبێ بە تەمابوونی کاڵایەکی بڕاوەو بەبێ تەصەننوع کردن، بەڵکو بەندە دەبێت بە ئومێدی پاداشتی خواو ترسان لە سزای و بەتەماعی ڕەزامەندی ئەو بێت.**[2]

**وە خوای گەورە لە قورئانی پیرۆزدا فەرمانی کردووە بە ئیخلاص. وەك دەفەرموێت:** ﴿قُلْ أَمَرَ رَبِّي بِالْقِسْطِ وَأَقِيمُواْ وُجُوهَكُمْ عِندَ كُلِّ مَسْجِدٍ وَادْعُوهُ مُخْلِصِينَ لَهُ الدِّينَ كَمَا بَدَأَكُمْ تَعُودُونَ﴾.[3]

**واتە: (ئەی محمد(ﷺ) بڵێ: پەروەردگارم فەرمانی بە دادپەروەری داوە، لەکاتی هەرپەرستن و نوێژێکدا، لە هەموو مزگەوتێکدا، ڕووی دڵ و ڕوخسارتان بەڕاستی لە پەروەردگارتان بکەن و بیپەرستن و لێی بپاڕێنەوە،**

(١) الفوائد الجلية في المباحث الفرضية لسماحة الشيخ عبد العزيز بن عبد الله بن باز ص١٢ وعدة الباحث في أحكام التوارث للشيخ عبد العزيز الناصر الرشيد ص٤.

(٢) **بڕوانە:** مقومات الداعية الناجح للمؤلف ص٢٨٣.

(٣) سورة الأعراف، الآية: ٢٩.

لەکاتێکدا دینداری بێگەردو دڵسۆزانە هەر بۆ ئەو زاتەیە، چونکە هەر چۆن دروستی کردوون لە سەرەتاوە، لە ئایندەشدا هەر بۆ لای ئەو دەگەڕێنەوە...

وە دەفەرموێت: ﴿فَادْعُواْ اللَّهَ مُخْلِصِينَ لَهُ الدِّينَ وَلَوْ كَرِهَ الْكَافِرُونَ﴾.(١)

واتە: کەواتە ئەی ئیمانداران: ئێوە هەر هانا و هاوار بۆ خوا بەرن و ملکەچ و فەرمانبەرداری ئاین و بەرنامەکەی ئەو بن، ئەگەر چی کافرو بێ بڕواکان پێی سەغڵەت بن و پێیان ناخۆش بێت.

وە دەفەرموێت: ﴿أَلا لِلَّهِ الدِّينُ الْخَالِصُ وَالَّذِينَ اتَّخَذُواْ مِن دُونِهِ أَوْلِيَآءَ مَا نَعْبُدُهُمْ إِلا لِيُقَرِّبُونَآ إِلَى اللَّهِ زُلْفَى إِنَّ اللَّهَ يَحْكُمُ بَيْنَهُمْ فِي مَا هُمْ فِيهِ يَخْتَلِفُونَ إِنَّ اللَّهَ لا يَهْدِي مَنْ هُوَ كَاذِبٌ كَفَّارٌ﴾.(٢)

واتە: ئاگاداربن: دینی پاك و خاوێن تەنها بۆ خوایە، ئەوانەش جگە لەو زاتە کەسانی ترو شتی تر دەکەنە پشتیوانی خۆیان دەڵێن: ئێمە ئەم بت و شتانە ناپەرستین تەنها لەبەر ئەوەی لە خوا نزیکمان بخەنەوە، لەکاتێکدا ئەوان لەخواوە نزیکترن، بێگومان خوا داوەری دەکات لە نێوانیاندا، لەو شتانەدا کە کێشەیان لەسەری هەیەو ڕایان دەربارەی جۆراو جۆرە، بەڕاستی خوا ئەو بیروباوەڕ چەوتەیان لێوەرناگرێت و هیدایەت و ڕێنموویی ئەو کەسانە ناکات کە درۆزن و بێ باوەڕن.

وە دەفەرموێت: ﴿وَمَآ أُمِرُواْ إِلا لِيَعْبُدُواْ اللَّهَ مُخْلِصِينَ لَهُ الدِّينَ حُنَفَآءَ....﴾.(٣)

واتە: فەرمانیشیان پێنەدرابوو جگە بەوەی کە خواپەرستی بکەن و بەپاکی و دڵسۆزی و ملکەچی فەرمانبەرداری ئاین و بەرنامەکە بن و لابدەن لە هەموو ئایینێك و تەنها پابەندی ئایینی ئیسلام بن.

---

(١) سورة غافر، الآية: ١٤.

(٢) سورة الزمر، الآية: ٣.

(٣) سورة البينة، الآية: ٥.

وعن عبد الله بن عباس(رضي الله عنهما) قال: كنت خلف النبي(ﷺ) فقال: "يا غُلامُ إني أُعلِّمك كلمات: احفظ الله يحفظْكَ، احفظِ الله تجدْهُ تُجاهك، إذا سألت فاسأل الله، وإذا استعنت فاستعن بالله، واعلم أنَّ الأُمة لَوِ اجتمعت على أن ينفعوك بشيء لم ينفعوكَ إلا بشيء قد كتبه الله لك، وإن اجتمعوا على أن يضروك بشيء لم يضروك إلا بشيء قد كتبه الله عليك، رُفعتِ الأقلامُ وجفَّت الصُّحفُ".[1]

واتە: ئەی گەنج من چەند ووشەیەکت فێر دەکەم: سنووری خوای گەورە بپارێزە خوای گەورە دەتپارێزێت، سنووری خوا بپارێزە لە بەرەو ڕووتدا دەیبینیت دێت بە هاناتەوە، ئەگەر پاڕایتەوە تەنها لە خوا داوا بکە، وە ئەگەر پشتت بەست تەنها بە خوای ببەستە، وە چاك بزانە ئەگەر هەموو خەڵکی کۆببنەوە تا سودێکت پێ بگەیەنن ناتوانن هیچ سودێکت پێ بگەیەنن جگە لەوەی کە خوای گەورە بۆی نوسیویت، وە ئەگەر کۆببنەوە لەسەر ئەوەی زیانێکت پێ بگەیەنن هیچ زیانێکت لێ نادەن جگە لەوەی کە خوای گەورە لەسەری نوسیویت، قەڵەم هەڵگیراوەو پەڕاویش ووشك بۆتەوە.

وە داواکردن لە خوای گەورە: بریتییە لە پاڕانەوە لێی و ئومێد بوون پێی وەك دەفەرموێت: ﴿.....وَسْئَلُواْ اللَّهَ مِن فَضْلِهِ إِنَّ اللَّهَ كَانَ بِكُلِّ شَيْءٍ عَلِيمًا﴾.[2]

واتە: هەمیشە و بەردەوامیش داوای زیادە بەخشش و بەهرەی خوا بکەن، چونکە بەڕاستی خوا بەهەموو شتێك زانایە.

---

(١) أخرجه الترمذي ٤/٦٦٧ وقال: حديث حسن صحيح، وأحمد ١/٢٩٣، وصححه الألباني فيصحيح الترمذي ٢/٣٠٩.

(٢) سورة النساء، الآية: ٣٢.

**مـــــەرجی دووەم:** شـــوێن کـــەوتن(الْمُتابَعَـة): کــە ئەمـــەش مەرجـــە لـــە هـــەموو پەرستشەکاندا چونکە خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿قُلْ إِنَّمَآ أَنَا بَشَرٌ مِّثْلُكُمْ يُوحَى إِلَيَّ أَنَّمَآ إِلَهُكُمْ إِلَهٌ وَاحِدٌ فَمَن كَانَ يَرْجُواْ لِقَآءَ رَبِّهِ فَلْيَعْمَلْ عَمَلاً صَالِحًا وَلا يُشْرِكْ بِعِبَادَةِ رَبِّهِ أَحَدًا﴾.(١)

واتە: (ئەی پێغەمبەر(ﷺ) پێیان) بڵێ: بەڕاستی من تەنها ئادەمیزادێکم وەك ئێوە، بەڵام ئەوەندە هەیە وەحی و نیگام بۆ دێت (ئەم ڕاستیەتان تێبگەیەنم) کـە: بێگومـان خـوای ئێـوە خوایـەکی تـاك و تەنهایـە، جـا ئـەوەی دەیـەوێت بەدیداری پـەروەردگاری شـادببێت بـەخۆشنودیەوە با کـارو کـردەوەی چاك و دروسـت ئـەنجام بـدات و بـەهیچ شـێوەیەك لـە پەرستندا هـیچ کەسـێك نەکاتـە هاوەڵ و شەریك بۆی.

وە کـرداری چاك(العمل الصالح) ئەوەیـە کـە مووافەقـەی شـەرعی خـوای گـەورە بێـت و مەبەسـت پێـی ڕەزامەنـدی ئـەو بێـت. جا پێویسـتە پاڕانـەوەو کـردەوە تەنها لەبەر خوا بێت و بە پێی شەریعەتەکەی پێغەمبەری خوا بێت(ﷺ).(٢)

لەبەر ئەوە فُضَيلی کوڕی عیاض لە تەفسیری ئایەتی:﴿تَبَارَكَ الَّذِي بِيَدِهِ الْمُلْكُ وَهُوَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ، الَّذِي خَلَقَ الْمَوْتَ وَالْحَيَاةَ لِيَبْلُوَكُمْ أَيُّكُمْ أَحْسَنُ عَمَلاً وَهُوَ الْعَزِيزُ الْغَفُورُ﴾.(٣)

واتـە: گـەورەو موبـارەك و پـیرۆزە، ئـەو زاتـەی کـە هـەموو بوونـەوەرو جیهـانی بەدەستە، ئەو زاتەی دەسـەڵاتی بەسـەر هـەموو شتێکدا هەیـە. هـەر ئـەو خـۆی مـردن و ژیـانی بـەدیهێناوە، تـا تاقیتـان بکاتـەوە، کێتـان کـردەوەی چـاکترو

---

(١) سورة الكهف، الآية: ١١٠.

(٢) انظر: تفسير ابن كثير ٣/١٠٩.

(٣) سورة الملك، الآيتان: ١، ٢.

**پەسـەندترە، هـەر ئـەویش زاتێكـی باڵادەسـتە بەسـەر بـێ باوەڕانـدا، وە لێخۆشبووە لە ئیمانداران.**

**فەرمویەتی:** (هو أخلصه وأصوبه)**بریتیـیە لە پاكترین و تەواوترین، ووتیان: ئەی باوكی عەلی پاكترین و تەواوترین چیـیە؟ فەرموی:** "إن العمل إذا كان خالصاً ولم يكن صواباً لم يقبل، وإذا كان صواباً ولم يكن خالصاً لم يقبل، حتى يكون خالصاً صواباً. والخالص أن يكون لله، والصواب أن يكون على السنة".(١)

**واتە: ئەوەیە ئەگەر كردەوە پاك بێت بەڵام تـەواو نـەبێت ئـەوە وەرناگیرێت، وە ئەگـەر تـەواو بێـت و پـاك نـەبێت هـەر وەرناگیرێـت، وە پێویسـتە پـاك و تـەواو بێت، پاك ئەوەیە لەبەر خوای گەورە ئەنجام بدرێت، وە تەواو ئەوەیە كە لەسەر سوننەتی پێغەمبەر(ﷺ) بێت.**

**پاشان ئەم ئایەتەی خوێندەوە:** ﴿قُلْ إِنَّمَآ أَنَا بَشَرٌ مِّثْلُكُمْ يُوحَى إِلَيَّ أَنَّمَآ إِلَهُكُمْ إِلَهٌ وَاحِدٌ فَمَن كَانَ يَرْجُو لِقَآءَ رَبِّهِ فَلْيَعْمَلْ عَمَلاً صَالِحًا وَلا يُشْرِكْ بِعِبَادَةِ رَبِّهِ أَحَدًا﴾.(٢)

**واتە: (ئەی پێغەمبەر (ﷺ) پێیان) بڵێ: بەڕاستی من تـەنها ئـادەمیزادێكم وەك ئێوە، بەڵام ئەوەندە هەیە وەحی و نیگام بۆ دێـت (ئـەم ڕاستیەتان تێبگەیـەنم) كـە: بێگومـان خـوای ئێـوە خوایـەكی تـاك و تەنهایـە، جـا ئـەوەی دەیـەوێت بەدیداری پەروەردگاری شادببێت، بەخۆشنودیەوە با كـارو كـردەوەی چاك و دروسـت ئـەنجام بـدات و بـەهیچ شـێوەیەك لـە پەرسـتندا هـیچ كەسـێك نەكاتـە هاوەڵ و شەریك بۆی.**

**وە خـوای گـەورە فەرمویـەتی:** ﴿وَمَنْ أَحْسَنُ دِينًا مِّمَّنْ أَسْلَمَ وَجْهَهُ للَّهِ وَهُوَ مُحْسِنٌ واتَّبَعَ مِلَّةَ إِبْرَاهِيمَ حَنِيفًا وَاتَّخَذَ اللَّهُ إِبْرَاهِيمَ خَلِيلاً﴾.(٣)

---

(١) انظر: مدارج السالكين لابن القيم ٢/٨٩.

(٢) سورة الكهف، الآية: ١١٠.

(٣) سورة النساء، الآية: ١٢٥.

واتـە: کـێ هەیـە ئـاینی چـاکترە پەسـەندترو جـوانتر بێـت لـەو کەسـەی ڕووی کردۆتە خوا و خۆی تەسلیمی ئەو زاتە کردووەو لەکاتێکدا کارجوان و کار پەسەندەو شوێنی ئاینی ئیبراهیمی ملکەچ و فەرمانبەردار کەوتبێت، کە خوا ئیبراهیمی کردۆتە خۆشەویستی خۆی ڕێزداری کردووە.

وە خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَمَن يُسْلِمْ وَجْهَهُ إِلَى اللَّهِ وَهُوَ مُحْسِنٌ فَقَدِ اسْتَمْسَكَ بِالْعُرْوَةِ الْوُثْقَى وَإِلَى اللَّهِ عَاقِبَةُ الأُمُورِ﴾.[1]

واتە: ئەو کەسەی ڕوو بکاتە پەروەردگاری و کارەکانی هەمووی بگێڕێتەوە بۆ لای ئەو، لە کاتێکدا ئادەمیزادێکی چاکەخوازە، ئەوە بەڕاستی مانای وایە کە دەستی گرتووە بە هێزترین هۆکاری ڕزگاریـیەوە، وە سەرەنجامی هەموو کارێکیش هەر بۆ لای خوا دەگەڕێتەوە.

جا (إسلام الوجه)تەسلیم بوونی ڕوو: بریتیـیە لە پاکی نییەت و مەبەست و پاڕانەوەو کردار ئەنجامدان بۆ خوای گەورە، وە (الإحسان فيه) ئیحسان و چاکە کردن تیایدا: بریتیـیە لە شوێن پـێ هەڵگرتنی پێغەمبەری خوا(ﷺ) و سوننەتەکەی.[2]

جا پێویستە لەسەر موسڵمانان کە شوێن پـێ هەڵگری پێغەمبەری خوا(ﷺ) بێت لە هەموو کردارەکانیدا چونکە خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿لَقَدْ كَانَ لَكُمْ فِي رَسُولِ اللَّهِ أُسْوَةٌ حَسَنَةٌ لِّمَن كَانَ يَرْجُواْ اللَّهَ وَالْيَوْمَ الآخِرَ وَذَكَرَ اللَّهَ كَثِيرًا﴾.[3]

واتە: سوێند بەخوا بەڕاستی لەپێغەمبەری خوادا(ﷺ) چاکترین نموونەی تەواو ڕێکوپێك هەیە تا چاوی لـێ بکەن و شوێنی بکەون، بەتایبەت بۆ ئەو

---

(١) سورة لقمان، الآية: ٢٢.

(٢) انظر: مدارج السالكين ٢/٩٠.

(٣) سورة الأحزاب، الآية: ٢١.

کەسانەی ڕەزامەندی خوایان مەبەستە، سەرفرازی قیامەت ئاواتیانە، هەمیشە و بەردەوام یادی خوا بە زۆری ئەنجام دەدەن و زمانیان پاراوە بەیادی ئەو.

وە دەفەرموێت: ﴿قُلْ إِن كُنتُمْ تُحِبُّونَ اللَّهَ فَاتَّبِعُونِي يُحْبِبْكُمُ اللَّهُ وَيَغْفِرْ لَكُمْ ذُنُوبَكُمْ وَاللَّهُ غَفُورٌ رَّحِيمٌ﴾.(١)

واتە: (ئەی پێغەمبەر (ﷺ) بە ئیمانداران) بڵێ: ئەگەر ئێوە خواتان خۆش دەوێت دە شوێنی من بکەون و لە فەرمانی من دەرمەچن، ئەوکاتە خوایش ئێوەی خۆش دەوێت و لە گوناهو هەڵەکانیشتان خۆش دەبێت، ئەو خوایە لێخۆشبوو و میهرەبانە.

وە دەفەرموێت: ﴿..........وَاتَّبِعُوهُ لَعَلَّكُمْ تَهْتَدُونَ﴾. (٢)

واتە: دە ئێوەش شوێنی بکەون، بۆ ئەوەی ئێوە ڕێنموویی وەرگرن.

وە دەفەرموێت: ﴿قُلْ أَطِيعُواْ اللَّهَ وَأَطِيعُواْ الرَّسُولَ فَإِن تَوَلَّوْاْ فَإِنَّمَا عَلَيْهِ مَا حُمِّلَ وَعَلَيْكُم مَّا حُمِّلْتُمْ وَإِن تُطِيعُوهُ تَهْتَدُواْ وَمَا عَلَى الرَّسُولِ إِلاَّ الْبَلاغُ الْمُبِينُ﴾.(٣)

واتە: پێیان بڵێ: فەرمانبەرداری خواو فەرمانبەرداری پێغەمبەر(ﷺ) بن، خۆ ئەگەر پشتیان هەڵکرد، ئەوە ئەو تەنها گەیاندنی پەیامی خوای لەسەر شانە، ئێوەش سەرپێچی و یاخی بوونەکەتان لەسەرتان دەکەوێت، خۆ ئەگەر فەرمانبەرداری بن و گوێڕایەڵ و ملکەچ بن بە ڕاستی ئەوە هیدایەت وەردەگرن، دڵنیاش بن کە ئەرکی سەرشانی پێغەمبەر (ﷺ) تەنها گەیاندنێکی ڕوون و ئاشکرایە و هیچی تر نی یە.

وە گومانی تێدا نی‌یە هەرکردەوەیەك لەسەر شەریعەتی پێغەمبەر(ﷺ) ئەنجام نەدرێت بەتاڵە بە پێی فەرمودەکەی عائیشە(ڕەزای خوای لێ بێت) کە

---

(١) سورة آل عمران، الآية: ٣١.

(٢) سورة الأعراف، الآية: ١٥٨.

(٣) سورة النور، الآية: ٥٤.

پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرمویەتی: "من أحدث في أمرنا هذا ما ليس منه فهو ردٌّ".
واتە: هەرکەسێك تازەگەرییەك دابهێنێت کە لەم دینەی ئێمەدا نەبێت ئەوە ڕەد دەکرێتەوەو وەرناگیرێت.

**مەرجی سێیەم: متمانە بوون بە خوای گەورەو یەقین هەبوون بە وەڵامدانەوەی:**[1]

گەورەترین مەرجی قبوڵ بوونی پاڕانەوە متمانە بوونە بە خوای گەورە بەوەی بەسەر هەموو شتێکدا بە توانایەو بە هەر شتێك بڵێت ببە دەبێت، خوای گەورە دەفەموێت: ﴿إِنَّمَا قَوْلُنَا لِشَيْءٍ إِذَآ أَرَدْنَاهُ أَن نَّقُولَ لَهُ كُن فَيَكُونُ﴾.[2]
واتە: بەڕاستی کاتێك زیندوو کردنەوەو بەدیهێنانی هەر شتێکمان بوێت، تەنها ئەوەندەی دەوێت پێی بڵێین ببە! دەستبەجێ ئەویش دەبێت.
وە دەفەرموێت: ﴿إِنَّمَآ أَمْرُهُ إِذَآ أَرَادَ شَيْئًا أَنْ يَقُولَ لَهُ كُنْ فَيَكُونُ﴾.[3]
واتە: بێگومان هەر کاتێك فەرمانی خوا دەرچوو، ویستی شتێك جێبەجێ بکات و بیهێنێتە دی، پێی دەڵێت ببە، ئەویش دەستبەجێ و بێ دواکەوتن پێش دێت و ئەنجام دەدرێت و دروست دەبێت.
وە ئەوەی وا لە موسڵمان دەکات متمانەی زیاتری هەبێت بە خوا خۆی ئەوەیە کە چاك بزانێت خەزێنەی هەموو خێر و بەرەکەتێك تەنها لای خوایە، وەك دەفەرموێت: ﴿وَإِن مِّن شَيْءٍ إِلاَّ عِندَنَا خَزَآئِنُهُ وَمَا نُنَزِّلُهُ إِلاَّ بِقَدَرٍ مَّعْلُومٍ﴾[4]
واتە: هیچ شتێك نی یە (لە بەهرەو نازو نیعمەتەکان) کە گەنجینەکانی لای ئێمە نەبێت و ئێمە نایبەخشین بەئەندازەی دیاریکراو لە کاتی لەباردا نەبێت.

(١) انظر: جامع العلوم والحكم ٢/٤٠٧ ومجموع فتاوى ابن باز جمع الطيار ١/٢٥٨.
(٢) سورة النحل، الآية: ٤٠.
(٣) سورة يس، الآية: ٨٢.
(٤) سورة الحجر، الآية: ٢١.

**وه پێغەمبەری خوا(ﷺ) لە فەرمودەیەکی قودسیدا کە لە خوای گەورەوە دەیگێڕێتەوە دەفەرموێت:** "... يا عبادي لو أن أوَّلكم وآخركُم وإنسَكُم وجنَّكم قاموا في صعيدٍ واحدٍ فسألوني، فأعطيتُ كلَّ إنسانٍ مسألته، ما نقص ذلك مما عندي إلا كما يَنْقُصُ المِخْيَطُ إذا أُدخِلَ البَحْرَ".(1)

**واتە:.....ئەی بەندەکانم ئەگەر یەکەمین و دوایەمین و مرۆڤ و جنۆکەتان تێکڕا لەیەك دەشتدا کۆببنەوەو داوام لێ بکەن و منیش وەڵامی هەموویان بدەمەوەو چییان بوێت بیاندەمێ هیچ لە موڵکی من کەم ناکاتەوەو مەگەر بە ئەندازەی دەزوویەك کە هەڵیکێشی لە دەریایەك.**

**وە ئەمەش بەڵگەیە لەسەر تەواوی توانای خوای گەورەو تەواوی موڵکی، وە ئەوە دەگەیەنێت کە موڵك و خەزێنەکانی بە بەخشین نابڕێتەوەو کەم ناکات ئەگەرچی بە یەکەمین و دوایەمینەکانی دروستکراوەکانی ببەخشێت لە جنۆکەو ئادەمیزاد کە هەرچییەکی لێ داوا بکەن هەموو تێکڕا لە یەك کاتدا.(2)**

**بۆیە پێغەمبەری خوا(ﷺ) دەفەرموێت:** "يدُ الله(3) ملأى لا يَغِضُها نَفَقةٌ سحّاءُ(4) الليلَ والنهارَ أرأيتُم ما أنفقَ مُذْ خلَقَ السماءَ(5) والأرض فإنه لم يغِضْ ما في يده وكان عرشُهُ على الماءِ وبيده(6) الميزان يخفض ويرفع".(7)

---

(1) مسلم عن أبي ذر (رضي الله عنه) برقم ٢٥٧٧.

(2) جامع العلوم والحكم ٢/٤٨.

(3) في رواية مسلم: "يمين الله ملأى" رقم ٩٩٣.

(4) سحَّاءُ: أي دائمة الصب تصب العطاء صبّاً ولا ينقصها العطاء الدائم في الليل والنهار، انظر: الفتح ١٣/٣٩٥. واتە: بەردەوام بە لێزمە دەبەخشێت، بەخشینی زۆری لە شەوو ڕۆژدا لێی کەم ناکاتەوە.

(5) في رواية للبخاري بالجمع للسموات والأرض برقم ٧٤٤١.

(6) وفي رواية للبخاري ومسلم "وبيده الأخرى" رقم ٧٤١١، وفي مسلم ٩٩٣، والترمذي برقم ٣٠٤٥.

(7) البخاري بلفظه عن أبي هريرة رضي الله عنه برقم ٤٦٨٤، ومسلم بنحوه برقم ٩٩٣، والترمذي بلفظ: "يمين الرحمن ملأى" برقم ٣٠٤٥.

واتـە: دەسـتی خـوای گـەورە پـڕە و بەخشـینی زۆری لەشـەوو ڕۆژدا لێـی کـەم ناکـات. ئایـا نـەتانبینیوە لەوەتـەی خـوای گـەورە ئاسمـان و زەوی بـەدیهێناوە دەبەخشێت وە هـیچ لـەوەی کـە لـە دەسـتیایەتی کـەمی نـەکردووە، لـە کاتێکدا عەرشەکەی لەسەر ئاو بووەو بە دەستەکەی تری تەرازووی پێیە کەسانێك نـزم دەکاتەوەو کەسانێك نزم.

جا کاتێك موسڵمان ئـەوەی زانـی پێویسـتە لەسـەری بـە یەقینـەوە بپاڕێتـەوەو بەوەی کە وەڵامی دەدرێتەوە وەك پێشتر باسکرا، وە لەبـەر فەرمودەکـەی ئـەبی هـورەیرە(ڕەزای خـوای لێ بێـت) کـە پێغەمبـەری خـوا(ﷺ) فەرمویـەتـی : "ادعوا الله وأنتم موقنون بالإجابة..."[1] الحديث.

واتــە: لــە خــوای گــەورە بپاڕێنــەوە بــە شــێوەیەك یــەقینتان هــەبێت بــە وەڵامدانەوەی.....

لەبەر ئەوە پێغەمبەری خـوا(ﷺ) ڕوونـی کردۆتـەوە کـە خـوای گـەورە وەڵامـی پاڕانەوەی ئەو موسڵمانە دەداتەوە کـە مەرجەکانی جێبـەجێ کـردووەو کـاری بـە ئادابـەکانی پاڕانـەوە کـردووەو دوورکەوتووەتـەوە لـە بەربەسـتەکانی گـیرا بوونی دوعا، فەرمویەتی: "ما من مسلم يدعو الله بدعوة ليس فيها إثم ولا قطيعة رحم إلا أعطاه الله بها إحدى ثلاث"[2] الحديث.

واتـە: هـیچ موسـڵمانێك نیـیە کـە بپاڕێتـەوە لـەخوای گـەورە بەداواکارییـەك کەتاوانو پچڕاندنی بـەزەیی نـەبێت ئیلا خـوای گـەورە یـەکێك لـەم سێشـتەی دەداتێ....

---

(١) الترمذي ٥١٧/٥ وحسنه الشيخ ناصر الدين الألباني، في الأحاديث الصحيحة برقم ٥٩٤، وفي صحيح الترمذي برقم ٢٧٦٦، وأخرجه أحمد ١٧٧/٢، والحاكم ٤٩٣/١.

(٢) أحمد في المسند ١٨/٣، وفي الترمذي عن جابر بن عبد الله برقم ٣٣٨١، وعن عبادة بن الصامت برقم ٣٥٧٣، وحسنهما الألباني في صحيح الترمذي ١٤٠/٣، ١٨١.

**مەرجی چوارەم: ئامادە بوونی دڵ و خشوع و ئومێد بوون بەو پاداشتەی کە لای خوای گەورەیە و ترسان لە سزای، خوای گەورە وەسفی زەکەریا**(عليه الصلاة والسلام)**و خانەوادەکەی دەکات و دەفەرموێت:** ﴿وَزَكَرِيَّا إِذْ نَادَى رَبَّهُ رَبِّ لا تَذَرْنِي فَرْدًا وَأَنتَ خَيْرُ الْوَارِثِينَ، فَاسْتَجَبْنَا لَهُ وَوَهَبْنَا لَهُ يَحْيَى وَأَصْلَحْنَا لَهُ زَوْجَهُ إِنَّهُمْ كَانُواْ يُسَارِعُونَ فِي الْخَيْرَاتِ وَيَدْعُونَنَا رَغَبًا وَرَهَبًا وَكَانُواْ لَنَا خَاشِعِينَ﴾.[1]

**واتە: یادی (زەکەریا)ش بکەرەوە کاتێك هاناو هاواری بۆ پەروەردگاری بردو وتی: پەروەردگارا من بە تەنهایی مەهێڵەرەوە (نەوەیەکی چاك و پاکم پێ ببەخشە) تۆیش چاکترین زاتێکی لە پاش من و هەموو مردوویەك دەمێنیتەوە. ئینجا ئێمە نزاکەیمان گیرا کردو (یەحیا)مان پێبەخشی، هاوسەرەکەشیمان بۆ چاککرد کە منداڵی ببێ، چونکە بەڕاستی ئەوانە چالاك و گورجو گۆڵ بوون لە ئەنجامدانی هەموو خێرو چاکەیەکدا و نزای بەکوڵیان دەکرد، بە ئومێدی ڕەحمەت و بەهەشتی ئێمە و لە دۆزەخ و خەشمی ئێمە دەترسان و ئەوانە هەمیشە گەردن کەچ بوون بۆ ئێمە.**

**بۆیە لەسەر موسڵمان پێویستە لە کاتی پاڕانەوەدا دڵی بە ئاگا بێت وە ئەمەش گەورەترین مەرجی وەرگیرانی پاڕانەوەیە، هەروەك ئیبن ڕەجەب(ڕەحمەتی خوای لێ بێت) فەرمویەتی.**[2]

**وە لە فەرمودەدا هاتووە:** "ادعوا الله وأنتم موقنون بالإجابة، واعلموا أن الله لا يستجيب دعاءً من قلب غافل لاهٍ".[3]

---

(١) سورة الأنبياء، الآيتان: ٨٩، ٩٠.

(٢) جامع العلوم والحكم ٢/٤٠٣.

(٣) الترمذي برقم ٣٤٧٩، وله شاهد عند أحمد ٢/١٧٧ من حديث عبد الله بن عمر ولكنه من طريق ابن لهيعة، والحديث حسنه الألباني في الأحاديث الصحيحة برقم ٥٩٤، وفي صحيح سنن الترمذي برقم ٢٧٦٦.

واتە: لە خوای گەورە بپاڕێنەوەو یەقینتان هەبێت بە وەڵامدانەوەی، وە چاك بزانن خوای گەورە وەڵامی پاڕانەوەی دڵێکی بێ ئاگا ناداتەوە.

وە خوای گەورە فەرمانی کردووە بە ئامادە بوونی دڵ و خشوع بوون لە کاتی زیکر و پاڕانەوەدا، وەك فەرمویەتی: ﴿وَاذْكُر رَّبَّكَ فِي نَفْسِكَ تَضَرُّعاً وَخِيفَةً وَدُونَ الْجَهْرِ مِنَ الْقَوْلِ بِالْغُدُوِّ وَالآصَالِ وَلاَ تَكُن مِّنَ الْغَافِلِينَ﴾.(١)

واتە: یادی پەروەردگارت لە دڵ و دەروونی خۆتدا بە لاڵانەوەو ترسەوە بکەو، بێ دەنگ بەرز کردنەوە (لە نێوان چپە و ئاشکرادا)، لە بەیانیان و دەمەو ئێواراندا، لەبێئاگایان مەبە (ئەوانەی دڵیان غافڵە).

**مەرجی پێنجەم: عەزم و جەزم و سوور بوون لە پاڕانەوەدا:** موسڵمان ئەگەر لە خوای خۆی پاڕایەوە ئەوا پێویستە بە عەزم جەزمەوە بپاڕێتەوە، لەبەر ئەوەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) نەهی کردووە لە (الاستثناء) کردن لە پاڕانەوەدا:

عن أنس(رضي الله عنه) قال: قال رسول الله(ﷺ): "إذا دعا أحدكم فليعزم في الدعاء ولا يقلْ اللهم إن شئت فأعطني فإن الله لا مُسْتَكْرِهَ لهُ"(٢). وفي رواية: "فإن الله لا مُكْرِهَ له".(٣)

---

(١) سورة الأعراف، الآية: ٢٠٥.

(٢) البخاري برقم ٦٣٣٨، ومسلم برقم ٢٦٧٨.

(٣) والمراد باللفظين جميعاً أن الذي يحتاج إلى التعليق بالمشيئة هو الذي يحصل إكراهه على الشيء فيُخفف الأمر عليه حتى لا يشق عليه والله مُنزّهٌ عن ذلك/ فتح الباري ١١/١٤٠ وشرح النووي ١٧/١٠.

واتە: وە مەبەست بەو دوو لەفزە ئەوەیە: کەسێك پێویستی بەوەیە کە داوات لێ کرد پێی بڵێیت: ئەگەر ویستت لێیەتی، کە بگونجێت ڕووگیر ببێت و لە ڕوودا دابمێنێت و پێی ناخۆش بێت. بۆیە پێی دەڵێیت: ئەگەر ویستت لێیەتی، هەتا قورس و گرانی نەخرێتە سەری، بەڵام خوای گەورە لەم نوقسانیە بەریە.

واته: ئەگەر یەکێك لە ئێوە پاڕایەوە با بە عەزمەوە بپاڕێتەوەو نەڵێت: خوایە ئەگەر ئەتەوێت پێم ببەخشە، چونکە خوای گەورە ناچارکراوو زۆر لێ کراو نییە بۆ وەڵامدانەوە.

وعن أبي هريرة(رضي الله عنه) قال: قال النبي(ﷺ): "لا يَقُولَنَّ أحدكم: اللهم اغفر لي إن شئت، اللهم ارحمني إن شئت، ولكن ليعزم المسألة وليُعظِّم الرغبة فإن الله لا يتعاظمُهُ شيءٌ إلا أعطاه".[1]

واته: کەس لە ئێوە نەڵێت خوایە لێم خۆشبە ئەگەر ویستت لێیەتی. وە خوایە ڕەحمم پێ بکە ئەگەر ویستت لێیەتی. بەڵام بە عەزم و ئومێدێکی گەورەوە داوا بکات چونکە خوای گەورە هەرشتێکی بە گەورەیی لێ داوا بکرێت دەیبەخشێت.

**باسی دووەم: ڕێگرەکانی وەڵامدانەوەی پاڕانەوە**(موانع إجابة الدعاء):

**ڕێگر (المانِع) لە زمانەوانیدا بەربەستی نێوان دوو شتە. لە شەرعدا:** (ما يلزم من وجوده العدم ولا يلزم من عدمه وجود، ولا عدم لذاته، عكس الشرط).[2]

**واته: ئەو شتەیە لە کاتی بوونیدا نەبوون دێتە ئاراوە، بەڵام بە نەبوونی ئەو بوون و نەبوون نایەتە ئاراوە، بە پێچەوانەی مەرجەوە.**

---

(١) البخاري برقم ٦٣٣٩، ومسلم واللفظ له برقم ٢٦٧٩.

(٢) الفوائد الجلية في المباحث الفرضية لسماحة الشيخ عبد العزيز بن عبد الله بن باز ص١٢، وعدة الباحث في أحكام التوارث للشيخ عبد العزيز الناصر الرشيد ص٧.

**لەو ڕێگرانەش ئەمانەن:**

**ڕێگـــری یەکـــەم: ڕۆچـوون لـە حەرامـدا: لـە خـواردن، خواردنـەوە، پۆشـاك، گۆشبوون.**[1]

عن أبي هريرة(رضي الله عنه) قال: قال رسول الله(ﷺ): "يا أيها الناس إن الله طيّبٌ لا يقبلُ إلا طيباً، وإن الله تعالى أمر المؤمنين بما أمر به المرسلين، فقال تعالى: ﴿يَآ أَيُّهَا الرُّسُلُ كُلُواْ مِنَ الطَّيِّبَاتِ وَاعْمَلُواْ صَالِحًا إِنِّي بِمَا تَعْمَلُونَ عَلِيمٌ﴾[2]. وقال: ﴿يَآ أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ كُلُواْ مِن طَيِّبَاتِ مَا رَزَقْنَاكُمْ﴾[3]. ثم ذكر الرجل يطيل السفر أشعث أغبر يمد يديه إلى السماء: يا ربِّ! يا ربِّ! ومطعمُهُ حرامٌ، ومشربُهُ حرامٌ، وملبسُهُ حرامٌ، وغُذِيَ بالحرام فأنَّى يُستجاب لذلك".[4]

**واتـە: ئـەی خەڵکینـە خـوای گـەورە پاکـەو پـاکیش نـەبێت وەری ناگرێـت، وە فـەرمانی کـردووە بـە ئیمانـداران بـەو شـتەی کـە فـەرمانی کـردووە بـە پێغەمبـەرانیش، وەك فەرمویـەتی:** [يَآ أَيُّهَا الرُّسُلُ كُلُواْ مِنَ الطَّيِّبَاتِ وَاعْمَلُواْ صَالِحًا إِنِّي بِمَا تَعْمَلُونَ عَلِيمٌ] **واتە: ئینجا وتمان: ئەی گرۆی پێغەمبـەران، بخـۆن لە ڕزق و ڕۆزیە چاك و پاکەکان، کارو کردەوەی چاکیش ئەنجام بدەن، بـە ڕاسـتی من زانام بە هەموو ئەو کارو کردەوانەی کە دەیکەن.**

**وە فەرمویەتی:** [يَآ أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ كُلُواْ مِن طَيِّبَاتِ مَا رَزَقْنَاكُمْ.....]**.واتـە: ئـەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە، بخۆن لـەو ڕزق و ڕۆزیـە چاك و باشانەی کە پێمـان بەخشیوون.**

---

(١) جامع العلوم والحكم ١/٢٧٧.

(٢) سورة المؤمنون، الآية: ٥١.

(٣) سورة البقرة، الآية: ١٧٢.

(٤) مسلم برقم ١٠١٥.

**پاشـان باسـی پیـاوێکی کـرد لـه سـەفەری دوور و درێژدایـه قـژ ئاڵۆزکـاو و تۆزاوی، دەستەکانی بەرەو ئاسمان بەرز دەکاتـەوەو دەڵێت: پـەروەردگارا.... پەروەردگارا.. لە کاتێکدا خـواردنی حەرامـەو خواردنـەوەی حەرامـەو پۆشـاکی حەرامەو بە حەرام گۆشکراوە، ئیتر چۆن وەلاّم دەدرێتەوە.**

**وە لـه مانـای ئـەم فەرمودەیـەدا هـەروەك ابـن رجـب(ڕەحمـەتی خـوای لێ بێـت) هێناویەتی ووتراوە: (خوای گـەورە هـیچ کردەوەیـەك وەرناگرێـت تـەنها ئەوانـه نەبێت کە پاکە لە هەموو تێکدەرەکانی وەك ڕیاو عوجب، وە هیچ سامانێکیش وەرناگرێـت تـەنها ئەوانـه نـەبێت کـه پاکـەو حەڵاڵـه چـونکە وەسـفی پـاکێتی دەردێتە پاڵ کردارەکان و گوفتارەکان و بیروباوەڕەکانیش.**[1]

**وە مەبەسـت بەمـەش ئەوەیـە کـە پێغەمبـەران**(علـيهم الصـلاة والسـلام) **و نەتەوەکانیشیان فەرمانیان پێکراوە بە خواردنی شتی پاك و دوورکەوتنەوە لە شتە پیس و حەرامکراوەکان.**

**پاشـان لـە کۆتـایی فەرمودەکـەدا بـاس لـەوە کـراوە کـە زۆر دوورە پاڕانـەوەی کەسـێك گـیرا ببێـت کـە لـە حەرامکراوەکانـدا ڕۆچـووبێت لـە بـواری خـواردن و خواردنەوەو پۆشـاك و گۆشـبووندا. هـەر لەبەرئەمەشـە هـاوەڵان(ڕەزای خوایـان لێ بێت) و پیاوچاکان زۆر ووردو ووریا بوون لە خواردنی حەڵاڵ دوورکەوتنـەو لـە حەرام.**

عن عائشة(رضي الله عنها) قالت: "كان لأبي بكر غلامٌ يُخرج له الخراجَ وكان أبو بكر يأكل من خراجه[2]، فجاء يوماً بشيء فأكله أبو بكر فقال له الغلام: أتدري ما هذا؟ فقال أبو بكر: وما هو؟ قال: كنتُ تكهَّنتُ لإنسانٍ في الجاهلية وما أُحسِنُ الكِهانةَ إلا أني

---

(١) جامع العلوم والحكم ١/٢٥٩.

(٢) أي يأتيه بما يكسبه والخراج ما يقرره السيد على عبده من مال يحضره له من كسبه. الفتح ٧/١٥٤.

**واتە: لەوەی پەیدای دەکات بۆی دەهێنێت، وە(الخراج) ئەو برە پارەیەیە کە خاوەن لەسەر عەبدەکەی دیاری دەکات کە لەو کاسپییەی پەیدای کردووە بیهێنێت.**

خَدعتُهُ فأعطاني بذلك، فهذا الذي أكلتَ منه، فأدخل أبو بكر يده[٣] فقاءَ كلَّ شيء في بطنه". [٤]

ورُوي في رواية لأبي نُعيم في الحلية وأحمد في الزهد "فقيل له يرحمك الله كلُّ هذا من أجل هذه اللقمة؟ قال: لو لم تخرج إلا مع نفسي لأخرجتها، سمعت رسول الله (ﷺ) يقول: "كلُّ جسد نبت من سُحْتٍ فالنارُ أولى به" فخشيت أن ينبت شيء من جسدي من هذه اللقمة. [٥]

**واتـه: ئەبوبـەكر(ڕەزای خـوای لێ بێـت) خزمـەتكارێكی هـەبوو (خـەراجی دەدا)و كاسپی دەكردو ئەبوبەكریش لـە كاسپییەكەی دەخـوارد، ڕۆژێكیـان شـتێكی هێنـاو ئەبوبـەكریش لێـی خـوارد، بەندەكـە ووتـی: ئـەزانیت ئـەوە چـی بـوو؟ ئەبوبەكر فەرمووی: چی بوو؟ ووتی: لە سەردەمی نەفامیدا فاڵگریم دەكرد بۆ كەسێك وە شارەزاییشم لێـی نـەبوو، بـەڵام هـەڵم خەڵەتانـدو ئـەویش شـتێكی دامـێ ئەمـە ئـەو شـتەیە كـە تـۆ لێـت خـوارد، ئـیتر ئەبوبـەكر دەسـتی كـرد بـە قوڕگیداو چی لە سكیدا بوو ڕشاندییەوە.**

**لـە ڕیوایەتەكـەی ابـو نعـیم دا هـاتووە: پێیـان ووت ڕەحمـەتت لێ بێـت ئەمـەت هـەمووی لەبـەر یـەك پـاروو كـرد؟! فـەرمووی: ئەگـەر لەگـەڵ ڕۆحمـدا نەبوایـە دەرنەچــووایە ئــەوا دەرم دەهێنایــەوە، بیســتومە پێغەمبــەری خــوا(ﷺ) فەرمویەتی: هەر لاشەیەك بە حـەرام گـەورە بووبێـت ئـاگر لـە پێشترە بۆی. جا من ترسام شتێك لە لاشەم بەو پارووە گەورە ببێت.**

**لە فەرمودەكەی ئەم باسەدا ئـەوەی تیایـە كـە ئـەو پیـاوەی لـە حەرامـدا ڕۆچـوو بوو چوار هۆكار لە هۆكارەكانی وەڵامدانەوەی پاڕانەوەی تێدا هاتبووە دی:**

---

(٣) فأدخل أبو بكر يده: أي أدخلها في حلقه. واتە: دەستی كرد بە قوڕگیدا.

(٤) البخاري برقم ٣٨٤٢، مع الفتح ١٤٩/٧.

(٥) أخرجه أبو نعيم في الحلية ٣١/١، وأحمد في الزهد بمعناه ص١٦٤، وصححه الألباني في صحيح الجامع عن جابر عند أحمد والدارمي والحاكم. انظر: صحيح الجامع ١٧٢/٤ .

١– درێژی سەفەر.

٢–شپرزەیی لە پۆشاك و ڕواڵەتیدا چونكە پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرمویەتی: "ربَّ أشْعَثَ[١] مدفوعٍ بالأبواب لو أقسم على الله لأبره".[٢] واتە: كەسانێك هەن قژ ئاڵۆزكاوی شپرزە لە بەر دەرگاكان پاڵی پێوەدەنرێ و دەردەكرێ، ئەگەر سوێند لەسەر خوای گەورە بخوات بۆی جێبەجێ دەكات.

٣–هەردوو دەستی بەرز كردبووەوە بۆ ئاسمان، پێغەمبەری خوا(ﷺ) دەفەرموێت: "إن الله حيي كريم يستحي من عبده إذا رفع إليه يديه أن يردهما صفراً خائبتين"[٣] واتە: خوای گەورە زۆر بەشەرم و بەخشندەیە شەرم دەكات كاتێ بەندەیەكی دەستەكانی بەرز دەكاتەوەو لێی دەپاڕێتەوە كە بە بێ ئومێدی دەستەكانی بگێڕێتەوە.

٤– زۆر داوا كردن و سوور بوون، ئەویش بە دووبارە كردنەوەی ووشەی پەروەردگارێتی خوا. كە ئەمەش یەكێكە لە گەورەترینی ئەو شتانەی وەڵامدانەوەی دوعا پێویستی پێیەتی.

---

(١) الأشعث: واتە: قژ ئاڵۆزكاویو تۆزاوی، بە شێوەیەك نە چەور كراوەو نە داهێنراوە.

(٢) مسلم برقم ٢٦٢٢.

[ڕوونكردنەوە: ئیمامی نەوەوی(ڕەحمەتی خوای لێ بێت) فەرمویەتی: ( لَوْ أَقْسَمَ عَلَى اللَّه لَأَبَرَّهُ ) أَيْ حَلِف عَلَى وُقُوع شَيْء أَوْقَعَهُ اللَّه إِكْرَامًا لَهُ بِإِجَابَةِ سُؤَاله ، وَصِيَانَته مِنْ الْحِنْث فِي يَمِينه ، وَهَذَا لِعِظَمِ مَنْزِلَته عِنْد اللَّه تَعَالَى ، وَإِنْ كَانَ حَقِيرًا عِنْد النَّاس . وَقِيلَ : مَعْنَى الْقَسَم هُنَا الدُّعَاء ، وَإِبْرَاره إِجَابَته . وَاَللَّه أَعْلَم ./ شرح النووي على مسلم (٨/ ٤٦٢).

واتە: ئەگەر سوێند بخوات بۆ ڕوودانی شتێك ئەوا خوای گەورە ڕووداوەكە دینێتە بوون و وەك ڕێزێك بۆی وەڵامی داواكەی دەداتەوە، وە هەتا سوێنەكەی نەكەوێت، ئەمەش لەبەر گەورەیی پلەی ئەو كەسەیە لای خوا، ئەگەرچی لای خەڵكیش بە كەمنرخ تەماشا بكرێت. وە ووتراوە مانای سوێند لێرەدا بریتیيە لە پاڕانەوە. وە جێبەجێ كردنی سوێندەكەی وەڵامدانەوەیەتی. والله أعلم- وەرگێڕ-].

(٣) أبو داود ٢/٧٨ برقم ١٤٨٨، والترمذي ٥/٥٥٧، وابن ماجه ٢/١٢٧١، والبغوي في شرح السنة ٥/١٨٥، وصححه الألباني في صحيح الترمذي ٣/١٧٩ وصحيح ابن ماجه برقم ٣٨٦٥.

کەچی لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرموی: "فأنى يستجاب لذلك" چۆن وەڵام دەدرێتەوە؟! کە ئەویش پرسیارێکە بە شێوەی سەرسوڕمان و نەهاتنە دی.[1] بۆیە لەسەر عەبدی موسڵمان پێویستە تەوبە بکات لە هەموو گوناه و تاوانەکان و هەموو مافی ستەم لێ کراوان بگەڕێنێتەوە هەتا لەم ڕێگرە گەورەیە ڕزگاری ببێت کە دەبێتە هۆی وەڵام نەدانەوەی پاڕانەوە.

**ڕێگری دووەم:** پەلە کردن و واز هێنان لە پاڕانەوە: یەکێکی تر لەو ڕێگرانەی دەبنە هۆی وەڵام نەدانەوەی پاڕانەوە ئەوەیە کە مرۆڤی موسڵمان پەلە بکات و واز لە پاڕانەوە بهێنێت، بە هۆی ئەوەی وەڵامدانەوەکەی درەنگ کەوتووە.[2] پێغەمبەری خوا(ﷺ) ئەمەی کردۆتە بەربەستێك لە بەربەستەکانی وەڵامدانەوە، بۆ ئەوەی بەندەی موسڵمان بێ ئومێد نەبێت لە وەڵامی پاڕانەوەکەی ئەگەر ماوەیەکی درێژیشی پێ بچێت. چونکە خوای گەورە ئەو کەسانەی خۆشدەوێت کە زۆر (إلحاح) دەکەن لە پاڕانەوەدا.[3]

عن أبي هريرة(رضي الله عنه) أن رسول الله(ﷺ) قال: "يُستجاب لأحدكم ما لم يعجلْ فيقول: قد دعوتُ فلم يُستجَبْ لي".[4]

واتە: وەڵامی پاڕانەوەی هەریەکێك لە ئێوە دەدرێتەوە مادامێك پەلە نەکات و نەڵێت: پاڕامەوە بەڵام وەڵام نەدرامەوە.

---

(١) جامع العلوم والحكم ١/٢٦٩، ٢٧٥ و١/٢٦٩-٢٧٥.

(٢) جامع العلوم والحكم ٢/٤٠٣.

(٣) جامع العلوم والحكم ٢/٤٠٣.

(٤) البخاري برقم ٦٣٤٠، ومسلم برقم ٢٧٣٥.

وعنه(رضي الله عنه) عن النبي(ﷺ) أنه قال: "لا يزالُ يستجاب للعبد ما لم يدعُ بإثم أو قطيعةِ رحمٍ ما لم يستعجل". قيل: يا رسول الله! ما الاستعجال؟ قال: "يقول قد دعوتُ، وقد دعوتُ فلم أرَ يستجيبُ لي فيستحسر[٢] عند ذلك ويدعُ الدعاءَ".[١]

واته: بەردەوام وەڵامی پاڕانەوەی بەندە دەدرێتەوە مادام نەپاڕێتەوە بە تاوان یان پچڕاندنی سیلەی ڕەحم، بەو مەرجەی پەلە نەکات، وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) پەلە کردن چیە؟ فەرموی: ئەوەیە بڵێت: پاڕامەوەو پاڕامەوە کەچی نەمبینی وەڵام بدرێمەوەو دوعاکەم گیرا ببێت. ئەو کات دەست هەڵدەگرێت و واز لە پاڕانەوە دێنێت.

جا نابێت بەندە پەلە بکات لەکاتی وەڵام نەدانەوەی پاڕانەوەکەیدا چونکە خوای گەورە پاڕانەوە دوا دەخات لەبەر چەند هۆکارێك: یان ئەوەتا کەسەکە هەڵنەستاوە بە ئەنجامدانی مەرجەکانی، یان کەوتۆتە ناو بەربەستێك لە بەربەستەکانی، یان لەبەر چەند هۆکارێك کە لەبەرژەوەندی کەسەکەدایەو خۆی نایزانێت. کەواتە لەسەر بەندە پێویستە کاتێك دوعاکانی گیرا نەبوون بە خۆیدا بچێتەوەو تەوبە بکات و بگەڕێتەوە بۆ لای خوای گەورە لە هەموو تاوانەکانی، وە دڵخۆش بێت بەخێرو چاکەی پێشخراو یان دواخراو بۆی. خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَلاَ تُفْسِدُواْ فِي الأَرْضِ بَعْدَ إِصْلاَحِهَا وَادْعُوهُ خَوْفًا وَطَمَعًا إِنَّ رَحْمَتَ اللَّهِ قَرِيبٌ مِّنَ الْمُحْسِنِينَ﴾.[٣]

---

(١) وەمانای (يستحسر): أي ينقطع عن الدعاء ومنه قوله تعالى: [لا يَسْتَكْبِرُونَ عَنْ عِبَادَتِهِ وَلا يَسْتَحْسِرُونَ] أي لا ينقطعون عنها. / انظر: شرح النووي، والفتح ١١/١٤١.

واتە: وازبێنێت لە پاڕانەوە، هەرلەوەشە خوای گەورە دەفەرموێت: [لا يَسْتَكْبِرُونَ عَنْ عِبَادَتِهِ وَلا يَسْتَحْسِرُونَ] واتە: لێی دانابڕێن.

(٢) مسلم ٤/٢٠٩٦.

(٣) سورة الأعراف، الآية: ٥٦.

واته: (خەڵكینه) فەساد و گوناه و تاوان ئەنجام مەدەن لە زەویدا دوای ئەوەی چاكەكاریی ڕەنگی گرتووەو (خەڵكی خەریكن خووی پێوە دەگرن)، بەردەوام هاناو هاوار بۆ خوا بەرن لە ترسی سزای دۆزەخ و بەئومێدی بەدەستهێنانی بەهەشت، بەڕاستی ڕەحمەتی خوا نزیكە لە چاكەكاران و چاكەخوازانەوە.

جا مادام بەندە سوور بێت لەسەر داواكردن و پاڕانەوەو تەماعی هەبێت لە وەڵامدانەوە بە بێ پچڕان، ئەوە وەڵامدانەوەی نزیكە، چونكە هەركەس بە بەردەوامی لە دەرگا بدات نزیكە لێی بكرێتەوە.[1]

وە ئەگونجێت وەڵامی پاڕانەوەكە دوا بكەوێت بۆ ماوەیەكی زۆر دوورو درێژ هەروەك چۆن خوای گەورە وەڵامی پاڕانەوەی یەعقوب پێغەمبەری(علیه الصلاة والسلام) دواخست كە بۆ گەڕانەوەی یوسفی كوڕی(علیه الصلاة والسلام) دەیكرد، لە كاتێكدا پێغەمبەرێكی بەڕێزی خواش بوو. وە هەروەك چۆن خوای گەورە وەڵامی پاڕانەوەی ئەییوب پێغەمبەری(علیه الصلاة والسلام) دواخست لە لابردنی ناڕەحەتی و نەخۆشی لەسەری، وە ئەگونجێت لە بری ئەوە خوای گەورە چاكەیەكی باشتر لەوەی كە داوای دەكات ببەخشێت بەو كەسەی دەپاڕێتەوە، یان خراپەیەكی گەورەتری لەوەی كە بۆی پاڕاوەتەوە لەسەر لاببات.[2]

**ڕێگری سێیەم:** ئەنجامدانی تاوان و سەرپێچی و حەرام كراوەكان: زۆر جار ئەنجامدانی كردەوە حەرامكراوەكان دەبێتە هۆی ڕێگری لە وەڵامدانەوەی دوعا،[3]، لەبەر ئەوە هەندێك لە سەلەف فەرمویانە: (لا تستبطئ الإجابة وقد سددت طریقها بالمعاصي) واتە: وەڵامدانەوەی دوعاكەت بە خاو مەزانە كاتێك تۆ ڕێگەكەییت بە تاوان گرتووە.

---

(١) جامع العلوم والحكم ٢/٤٠٤.

(٢) بڕوانە: مجموع فتاوى العلامة ابن باز ١/٢٦١ جمع الطيار.

(٣) جامع العلوم والحكم ١/٢٧٥.

بۆیە هەندێك لە شاعیرەكان ئەمەیان كردووە بە هۆنراوەو وتویانە:

نحنُ ندعو الإله في كلِّ كربٍ    ثمَّ ننساه عند كشف الكروبِ

كيف نرجو إجابةً لدُعاءٍ    قد سددْنا طريقها بالذنوب[1]

واتە: ئێمە لە خوای گەورە دەپاڕێینەوە لە هەموو ناڕەحەتییەكدا، كەچی لە دوای لابردنی ناخۆشییەكە لەسەرمان لە بیری دەكەین، چۆن ئومێدی وەڵامدانەوەی پاڕانەوەكانمانی لێ بكەین، لە كاتێكدا ڕێگای پاڕانەوەكەمان بە تاوان و سەرپێچی گرتووە.

وە گومانی تێدا نییە بێ ئاگا بوون و كەوتنە ناو ئارەزووە حەرامەكانەوە هۆكارێكە لە بێ بەش بوون لە هەموو خێرو چاكەكان، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿......إِنَّ اللَّهَ لاَ يُغَيِّرُ مَا بِقَوْمٍ حَتَّى يُغَيِّرُواْ مَا بِأَنْفُسِهِمْ وَإِذَآ أَرَادَ اللَّهُ بِقَوْمٍ سُوءًا فَلاَ مَرَدَّ لَهُ وَمَا لَهُم مِّن دُونِهِ مِن وَالٍ﴾.[2]

واتە: بێگومان خوا بارودۆخی هیچ قەوم و گەلێك ناگۆڕێت (لە خۆشییەوە بۆ ناخۆشی، یان لە زەلیلییەوە بۆ سەربەرزی، یان لە گرانییەوە بۆ هەرزانی) هەتا ئەوان ئەوەی بە خۆیان دەكرێت نەیگۆڕن و نەیكەن، كاتێكیش خوا بیەوێت بەڵایەك بەسەر هەر میللەتێكدا بهێنێت (لە دەرئەنجامی سەركەشی و یاخی بوونیان)، ئەوە هیچ هێزێك ناتوانێت بەری بگرێت، هیچ كەسیش ناتوانێت جگە لە خوا فریایان بكەوێت و ڕزگاریان بكات.

**ڕێگری چوارەم:** واز هێنان لەو واجباتانەی كە خوای گەورە واجبی كردووە:

هەروەك چۆن ئەنجامدانی كردارە چاكەكان هۆكارێكە بۆ گیرابوونی پاڕانەوە بە هەمان شێوەش واز هێنان لە واجباتەكان دەبێتە ڕێگرێك لە ڕێگرەكانی

---

(١) جامع العلوم والحكم ١/٣٧٧، وانظر: الحاكم ٢/٣٠٢ وسلسلة الأحاديث الصحيحة برقم ١٨٠٥.

(٢) سورة الرعد، الآية: ١١.

وەڵامدانەوەی پاڕانەوە.[1]، جا مانای ئەمەش لە فەرمودەکانی پێغەمبەری خوادا(ﷺ) هاتووە:

عن حذيفة(رضي الله عنه) عن النبي(ﷺ) قال: "والذي نفسي بيده لتأْمُرُنَّ بالمعروفِ ولتنهوُنَّ عن المنكر، أو ليُوشِكَنَّ اللهُ أنْ يبعثَ عليكم عِقاباً منه ثمَّ تدعونَهُ فلا يُستجابُ لكم".[2]

واتە: سوێند بێت بەو خوایەی نەفسی منی بەدەستە، یان ئەوەتا فەرمان دەکەن بە چاکەو بەرگری دەکەن لە خراپە، یان نزیکە کە خوای گەورە سزایەك بنێرێتە سەرتان، پاشان لێی بپاڕێنەوە وەڵامتان نەداتەوە.

**ڕێگری پێنجەم:** پاڕانەوە بە تاوان یان پچڕاندنی سیلەی ڕەحم.

**ڕێگری شەشەم:** حیکمەتێکی پەروەردگار بەوەی ئەو شتەی بۆی پاڕاوەتەوە چاکتری بداتیٚ:

عن أبي سعيد(رضي الله عنه) أن النبي(ﷺ) قال: "ما من مسلم يدعو الله بدعوةٍ ليس فيها إثم ولا قطيعة رحم إلا أعطاه الله بها إحدى ثلاث: إما أن تُعجَّل له دعوته، وإما أن

(١) جامع العلوم والحكم ٢٧٥/١.

(٢) الترمذي ٤٦٨/٤ وحسنه برقم ٢١٦٩، والبغوي في شرح السنة ٣٤٥/١٤، وأحمد ٣٨٨/٥، وانظر: صحيح الجامع برقم ٦٩٤٧، ٩٧/٦، وفي الباب عن عائشة(رضي الله عنها) ترفعه: "يا أيها الناس إن الله تبارك وتعالى يقول لكم: مروا بالمعروف وانهوا عن المنكر قبل أن تدعوني فلا أستجيب لكم، وتسألوني فلا أعطيكم، وتستنصروني فلا أنصركم" أحمد ١٥٩/٦. وانظر: المجمع ٢٦٦/٧.

واتە: ئەی خەڵکینە خوای گەورە پێتان دەفەرموێت: فەرمان بکەن بە چاکەو بەرگری بکەن لە خراپە پێش ئەوەی لێم بپاڕێنەوەو وەڵامتان نەدەمەوە، وە داوام لیٚ بکەن و نەتاندەمیٚ و داوای سەرخستنم لیٚ بکەن و سەرتان نەخەم.

يدخرها له في الآخرة، وإما أن يصرف عنه من السوء مثلها". قالوا: إذاً نكثِرَ. قال: "الله أكثر".[1]

واتـه: هـيچ موسـڵمانێك نىيـه كـه بپاڕێتـەوه لـەخواى گـەوره بەداواكارىيـەك كـەتاوان و پچـڕاندنى سـيلەى ڕەحـم نـەبێت ئـيلا خـواى گـەوره يـەكێك لـەم سىٚشتەى دەداتىٚ:

١- يان پاڕانەوەكەى بۆ پێش دەخات و گيرا دەبێت.

٢- يان بۆى هەڵدەگرىٚ بۆ پاداشتى قيامەت.

٣- يـان بەئەنـدازەى پاڕانەوەكـەى خراپـەو بـەلاًى لىٚـدوور دەخاتـەوە. وتيـان: كەواتـە زۆر دەپاڕێينـەوە. ئـەويش فـەرمووى: خـواى گـەوره زۆرتـر پاداشـتتان پىٚ دەبەخشىٚ.

لەوانەيــه مرۆڤێـك وا گومـان بـەرێت كـه پاڕانـەوەكى وەلاًم نەدراوەتـەوە، لـه كاتێكـدا لـەوەى داواى كـردووه زيـاترى پـىٚ بەخشـراوە، يـان لـه زۆر بـەلاًو نەخۆشى پارێزراوە، ياخود پاداشتەكەى بۆ دواخراوە بۆ ڕۆژى دوايى.[2]

(١) أحمد في المسند ١٨/٣ وتقدم تخريجه ص٢٠.

(٢) بڕوانە: مجموع فتاوى ابن باز ٢٥٨/١-٢٦٨ جمع الطيار.

## بەشی چوارەم: ئادابەکانی پاڕانەوەو کات و شوێنی وەلأمدانەوەی

### باسی یەکەم: ئادابەکانی پاڕانەوە:

**١- سەرەتا بە ستایشی خوای گەورەو صەلأوات دان لەسەر پێغەمبەری خوا(ﷺ) دەست پیٚ دەکات و هەر بەمەش کۆتایی پیٚ دەهێنێت:**

عن علي بن أبي طالب(رضي الله عنه) قال: "كُلُّ دُعاءٍ محجوب حتَّى يُصلَّى على محمد(ﷺ) وآل محمد".[(١)]

**واتە: هەموو پاڕانەوەیك بەربەستی لەبەردەمدا دانراوەو گیرا نابێت هەتا صەلأوات دەدرێت لەسەر پێغەمبەر(ﷺ)و کەسوکارو خانەوەدای پێغەمبەر(ﷺ).**

عن فضالة بن عبيد الله(رضي الله عنه) قال: سمع رسول الله(ﷺ) رجلاً يدعو في صلاته لم يمجِّد الله تعالى، ولم يصلِّ على النبي(ﷺ) فقال رسول الله(ﷺ): "عجَّل هذا" ثم دعاه فقال له أو لغيره: "إذا صلى أحدكم فليبدأ بتحميد الله والثناء عليه، ثم يصلي على النبي(ﷺ)، ثم يدعو بعدُ بما شاء".[(٢)]

**واتە: پێغەمبەری خوا(ﷺ) گوێی لە پیاوێك بوو لە نوێژەکەی‌دا دەپاڕایەوەو ستایشی خوای گەورەی نەکردو صەلأواتی نەدا لەسەر پێغەمبەر(ﷺ)، بۆیە**

---

(١) أخرجه الطبراني في الأوسط ٤/٤٤٨ مصورة الجامعة الإسلامية موقوفاً على علي (رضي الله عنه). قال الهيثمي في مجمع الزوائد ١٠/١٦٠: رجاله ثقات، ووافقه الألباني في سلسلة الأحاديث الصحيحة ٥/٥٧، والحديث له شواهد كثيرة عن معاذ بن جبل مرفوعاً، وعن عبد الله بن بسر مرفوعاً، وعن أنس رضي الله عنه، وعن عمر قال: "إن الدعاء موقوف بين السماء والأرض لا يصعد منه شيء حتى تصلي على نبيك (ﷺ)". الترمذي برقم ٤٩٠ قال العلامة الألباني: وخلاصة القول: أن الحديث بمجموع هذه الطرق والشواهد لا ينزل عن مرتبة الحسن إن شاء الله تعالى على أقل الأحوال. انظر: الأحاديث الصحيحة ٥/٥٧، رقم ٢٠٣٥، وصحيح الجامع ٤/٧٣، وصحيح الترمذي ١/١٥٠.

(٢) أبو داود ٢/٧٧ برقم ١٤٨١، والترمذي ٥/٥١٦ برقم ٣٤٧٧، وصححه الألباني في صحيح أبي داود برقم ١٣١٤، وصحيح الترمذي برقم ٢٧٦٧.

پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرمووی: ئەم پیاوە پەلەی کرد. پاشان بانگی کردو بەو یان بە کەسێکی تری فەرموو: ئەگەر یەکێك لە ئێوە نوێژی کرد با بە سوپاس و ستایشی خوای گەورە دەست پێ بکات و پاشان صەلأوات بدات لەسەر پێغەمبەر(ﷺ)، پاشان دوای ئەمە بپاڕێتەوە بەوەی کە خۆی دەیەوێت و ویستی لێیەتی.

ورأى رسول الله(ﷺ) رجلاً آخر يصلي فمجَّد الله، وحمده، وصلى على النبي(ﷺ) فقال رسول الله(ﷺ): "أيها المصلي ادعُ تُجَبْ [وسَلْ تُعْطَ]".(١)

واتە: پێغەمبەری خوا(ﷺ) پیاوێکی تری بینی نوێژی کردو سوپاس و ستایشی خوای گەورەی کردو صەلأواتی دا لەسەر پێغەمبەر(ﷺ)، پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرمووی: ئەی نوێژ خوێن بپاڕێرەوە وەلأم دەدرێیتەوە. وە داوا بکە پێت دەبەخشرێت.

عن عبد الله بن مسعود(رضي الله عنه) قال: كنت أصلي والنبي(ﷺ) وأبو بكر وعمر معه، فلما جلست بدأت بالثناء على الله، ثم الصلاة على النبي(ﷺ)، ثم دعوت لنفسي، فقال النبي(ﷺ): "سَلْ تُعطَهْ، سَلْ تُعطَهْ".(٢)

واتە: عبدالله ی کوڕی مەسعود(ڕەزای خوای لێ بێت) دەفەرموێت: من نوێژم دەکرد پێغەمبەری خوا(ﷺ) ئەبوبەکرو عومەری(ڕەزای خوایان لێ بێت) لەگەڵدا بوو، کاتێ دانیشتم سەرەتا ستایشی خوای گەورەم کردو پاشان صەلأواتم دا لە پێغەمبەر(ﷺ) پاشان پاڕامەوە بۆ خۆم ، پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرمووی: داوا بکە پێت دەبەخشرێت. داوابکە پێت دەبەخشرێت.

---

(١) النسائي ٣/٤٤، والترمذي ٥/٥١٦ برقم ٣٤٧٦، وما بين المعكوفين عند النسائي، وصححه الألباني في صحيح النسائي برقم ١٢١٧، وفي صحيح الترمذي برقم ٢٧٦٥.

(٢) الترمذي ٢/٤٨٨، وقال حديث حسن صحيح، وحسنه الألباني في مشكاة المصابيح ١/٢٩٤ برقم ٩٣١.

وە ئیمام ابن القیم(ڕەحمەتی خوای لێ بێت) باسی ئەوەی کردوە کە صەلاٚوات دان لەسەر پێغەمبەری خوا(ﷺ) لە کاتی پاڕانەوەدا سێ پلەی هەیە:

پلەی یەکەم: ئەوەیە کە لە پێش پاڕانەوەکەو دوای سوپاس و ستایشی خوای گەورە صەلاٚوات بدات لەسەر پێغەمبەری خوا(ﷺ).

پلەی دووەم: لە سەرەتاو ناوەڕاست و کۆتایی پاڕانەوەکەدا صەلاٚوات بدات لەسەر پێغەمبەری خوا(ﷺ).

پلەی سێیەم: لە سەرەتاو کۆتاییدا صەلاٚوات بدات و دواکردن و پێویستییەکەی بخاتە ناوەڕاستییانەوە.[1]

٢- پاڕانەوە لە کاتی خۆشی و ناخۆشیدا:

عن أبي هريرة(رضي الله عنه) قال: قال رسول الله(ﷺ): "منْ سَرَّهُ أنْ يستَجيبَ الله لهُ عِندَ الشَّدائدِ والكُرَبِ فلْيُكثِرِ الدُّعاءَ في الرَّخاءِ".[2]

واتە: هەرکەسێك پێی خۆشە کە خوای گەورە لە کاتی ناڕەحەتی و پێگیراندا وەڵامی بداتەوە با لە کاتی خۆشیدا زۆر بپاڕێتەوە.

وە مانای ئەمەش ئەوەیە: هەرکەسێك حەز دەکات لە کاتی ناڕەحەتیدا خوای گەورە وەڵامی بداتەوە کە ئەوەش کاتی ناخۆشی و کارەساتە.

وە(الكُرب): بریتییە لەو غەم پەژارەیەی کە نەفس دەگرێتەوە، ئەوا با زۆر بپاڕێتەوە لە کاتی لەش ساغی و دەست بە تاڵی و بێ وەییدا، چونکە لە سیمای بڕوادار ئەوەیە کە پەنا ببات بۆ خوای گەورەو بەردەوام پەیوەست پێت پێوەی، وە هانای بۆ بەرێت پێش ئەوەی بکەوێتە ناچاری.[3] خوای گەورە دەربارەی یونس پێغەمبەر(عليه الصلاة والسلام) کاتێ لە خوا پاڕایەوەو

---

(١) **بڕوانە**: جلاء الأفهام في فضل الصلاة والسلام على محمد خير الأنام (ﷺ) ص٣٧٥.

(٢) أخرجه الترمذي ٥/٤٦٢، برقم ٣٣٨٢، والحاكم ١/٥٤٤، وصححه ووافقه الذهبي، وحسنه الألباني في صحيح الترمذي ٣/١٤٠، وانظر: الأحاديث الصحيحة برقم ٥٩٣.

(٣) **بڕوانە**: تحفة الأحوذي ٩/٣٢٤.

**خوای گەورەش بە هانایەوە هات و وەڵامی دایەوەو ڕزگاری کرد دەفەرموێت:**

﴿فَلَوْلا أَنَّهُ كَانَ مِنَ الْمُسَبِّحِينَ، لَلَبِثَ فِي بَطْنِهِ إِلَى يَوْمِ يُبْعَثُونَ﴾.[1]

**واتە: خۆ ئەگەر لەو کەسانە نەبوایە کە تەسبیحات و یادی خوا دەکەن و نەیوتایە (لا اله الا انت سبحانك إني كنت من الظالمين) واتە: پەروەردگارا هیچ پەرستراوێك نیە بە هەق جگە لە تۆ، پاکی و بێگەردی و ستایش شایستەی تۆیە و من لە ستەمکارانم. ئەوە دەمایەوە لە سکی نەهەنگەکەدا تا ڕۆژێك کە هەمووان زیندوو دەکرێنەوە.**

**٣- لە کەسو کارو سامان و منداڵ و نەفسی خۆشی نەپاڕێتەوەو دوعایان لێ نەکات :**

عن جابر(رضي الله عنه) في الرجل الذي لعن بعيره، فقال رسول الله(ﷺ): "من هذا اللاعِنُ بعيرَهُ"؟ قال: أنا يا رسول الله! قال: "انزل عنهُ فلا تصحبنا بملعونٍ، لا تدعوا على أنفسكم، ولا تدعوا على أولادكم، ولا تدعوا على أموالكم، لا توافقُوا من الله ساعةً يُسألُ فيها عطاءٌ فيستجيبُ لكم".[2]

**واتە: لە جابرەوە(ڕەزای خوای لێ بێت) دەربارەی ئەو پیاوەی لەعنەتی لە حوشترەکەی خۆی کرد دەفەرموێت: پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرموی: ئەوە کێیە نەفرەت لە حوشترەکەی دەکات؟ فەرموی: منم ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ)، فەرموی: لە سەری دابەزە نەفرەت لێ کراوێکتان با لەگەڵدا نەبێت و مەیهێنە، دوعا لە خۆتان مەکەن، وە دوعا لە منداڵەکانتان مەکەن، وە دوعا لە سامانەکانتان مەکەن، نەبا هاوگیری کاتێك بن کە ئەگەر بەندە تیایدا لە خوای خۆی بپاڕێتەوە وەڵام دەدرێتەوە.**

---

(١) سورة الصافات، الآيتان: ١٤٣، ١٤٤.

(٢) أخرجه مسلم ٤/٢٣٠٤ برقم ٣٠٠٩.

٤- دەنگی لە کاتی پاڕانەوەدا نزم بکاتەوە لە نێوان ئاشکرا کردن و پەنهاندا:
أ . خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ادْعُواْ رَبَّكُمْ تَضَرُّعًا وَخُفْيَةً إِنَّهُ لاَ يُحِبُّ الْمُعْتَدِينَ﴾.[١]
واتە: هاناو هاوار بکەن لە پەروەردگارتان بەپاڕانەوەی بەکوڵ، بەنهێنی (لەکات و شوێنی لەباردا) چونکە بەڕاستی ئەو زاتە دەست درێژکارانی خۆش ناوێت (مەبەست ئەوانەن کە هاناو هاوار بۆ غەیری خوا دەبەن).
ب . وە دەفەرموێت: ﴿وَاذْكُر رَّبَّكَ فِي نَفْسِكَ تَضَرُّعاً وَخِيفَةً وَدُونَ الْجَهْرِ مِنَ الْقَوْلِ بِالْغُدُوِّ وَالآصَالِ وَلاَ تَكُن مِّنَ الْغَافِلِينَ﴾.[٢]
واتە: یادی پەروەردگارت لە دڵ و دەروونی خۆتدا بە لاڵانەوەو ترسەوە بکەو، بێ دەنگ بەرز کردنەوە ( لە نێوان چپە و ئاشکرادا)، لە بەیانیان و دەمە و ئێواراندا، لەبێئاگایان مەبە (ئەوانەی دڵیان غافڵە).
جـ . وعن أبي موسى(رضي الله عنه) قال: كنا مع النبي(ﷺ) في سفر فجعل الناس يجهرون بالتكبير، فقال النبي(ﷺ): "أيها الناس اربعوا على أنفسكم إنكم [لا تدعون أصمَّ ولا غائباً، إنكم تدعون سميعاً قريباً، وهو معكم".[٣]
واتە: ئەبی موسا(ڕەزای خوای لێ بێت) دەفەرموێت: ئێمە لە خزمەت پێغەمبەری خوادا(ﷺ) بووین خەڵکەکە بە ئاشکراو دەنگی بەرز تەکبیریان دەکرد، پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرمووی: ئەی خەڵکینە لەسەر خۆتان بن، ئێوە ناپاڕێنەوە نە لە کەڕ و نە لە غائیب، ئێوە لە خوایەکی بیسەری نزیك دەپاڕێنەوە کە لەگەڵتانە.
وە مانای لەگەڵتانە واتە بە زانست و ئاگادار بوونی، چونکە لەگەڵ بوون دوو جۆرە: لەگەڵ بونێکی گشتی و یەکێکی تایبەتی:

---

(١) سورة الأعراف، الآية: ٥٥.
(٢) سورة الأعراف، الآية: ٢٠٥.
(٣) البخاري برقم ٤٢٠٥ ومسلم بلفظه برقم ٢٧٠٤ إلا ما بين المعكوفين لفظ البخاري.

لەگەڵ بوونی گشتی‌یەکە: لەگەڵ بوونە بە زانست و چاودێری کردنی، لە کاتێکدا خۆی لەسەر عەرشەکەیەتی بەو جۆرەی کە لایەقە بە گەورەیی خۆی. وە ئاگای لەو شتەیە کە لە دەرونی بەندەکەی‌دایەو هیچ شتێکی لێ پەنهان نی‌یە.

وە لەگەڵ بوونی تایبەت: لەگەڵ بوونی سەرخستن و پشتگیری کردن و تەوفیق کردن و ڕێنمایی کردنی بەندە ئیمانداره‌کانی‌یەتی.

٥- کڕوزانەوە بۆ لای خوای گەورە لە پاڕانەوەدا: (الضراعة): واتە زەلیلی و ملکەچی و کزۆڵی دەربڕین، دەوترێت: (ضَرَعَ، يَضْرَعُ ضراعةً): واتە ملکەچ و زەلیل بوو، (وتضرع إلى الله): واتە بە کوڵ پاڕایەوە لە خوای گەورە.[1]

أ . خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿.....فَأَخَذْنَاهُمْ بِالْبَأْسَآءِ وَالضَّرَّآءِ لَعَلَّهُمْ يَتَضَرَّعُونَ، فَلَوْلا إِذْ جَآءَهُمْ بَأْسُنَا تَضَرَّعُواْ وَلَكِن قَسَتْ قُلُوبُهُمْ وَزَيَّنَ لَهُمُ الشَّيْطَانُ مَا كَانُواْ يَعْمَلُونَ﴾.[2]

واتە: ..تووشی تاڵاوی جەنگ و بەڵاو تەنگانەمان کردن بۆ ئەوەی لێمان بپاڕێنەوەو بلاڵێنەوە. ئەوانە کاتێك تۆڵەو سزای ئێمەیان بۆ هات، بۆ نزاو پاڕانەوەی بەکوڵیان نەکرد، بەڵام دڵیان ڕەق و ڕەش بوو، شەیتانیش ئەو کاروکردەوە ناپەسەندانەی بۆ ڕازاندبوونەوە کە دەیانکرد.

ب . وە دەفەرموێت: ﴿قُلْ مَن يُنَجِّيكُم مِّن ظُلُمَاتِ الْبَرِّ وَالْبَحْرِ تَدْعُونَهُ تَضَرُّعاً وَخُفْيَةً لَّئِنْ أَنجَانَا مِنْ هَذِهِ لَنَكُونَنَّ مِنَ الشَّاكِرِينَ﴾.[1]

---

(١) بڕوانە: المصباح المنير ص٣٦١، والقاموس المحيط ص٩٥٨، والمعجم الوسيط ص٥٣٨، ومفردات ألفاظ غريب القرآن للأصفهاني ص٥٠٦.

(٢) سورة الأنعام، الآيتان: ٤٢، ٤٣.

(١) سورة الأنعام، الآية: ٦٣.

واتە: ئەی محمد (ﷺ) پێیان بڵێ: کێ فریاتان دەکەوێت و ڕزگارتان دەکات لە تاریکیەکانی وشکانی و دەریادا، (کاتێك گیردەخۆن) و بە کەساسی لێی دەپاڕێنەوە، بەنهێنی هانای بۆ دەبەن، (پەیمان دەدەن و دەڵێن) سوێند بێت بە خوا ئەگەر لەم تەنگانەیە ڕزگارمان بکەیت، ئەوە بەدڵنیاییەوە دەچینە ڕیزی سوپاسگوزارانەوە.

جـ. وە دەفەرموێت: ﴿وَاذْكُر رَّبَّكَ فِي نَفْسِكَ تَضَرُّعاً وَخِيفَةً....﴾.[٢]

واتە: یادی پەروەردگارت لە دڵ و دەروونی خۆتدا بە لاڵانەوەو ترسەوە بکە..

٦ . لە پاڕانەوەکەیدا زۆر لە پەروەردگاری بپاڕێتەوەو (إلحاح بکات)دووبارەی بکاتەوە:

(الإلحاح): ڕووکردنە شتێك و بەردەوام بوونە لەسەری، دەوترێت (ألحّ السحاب) واتە هەورەکە بارانەکەی بەردەوام بوو، وە (ألحّت الناقة) واتە: ووشترەکە لە شوێنی خۆی جێگیر بوو. وە (ألحّ الجمل) واتە پەیوەست بوو بە شوێنەکەیەوەو یەخی دا، وە (ألح فلان علی شيء) واتە بەردەوام بوو پێوەی‌و ڕووی تێ کرد.[٣]

عن أنس(رضي الله عنه) يرفعه: "ألظُّوا بياذا الجلالِ والإكرام".[٤]

واتە: زۆر بەردەوام بن لەسەر ووتنی: (یا ذا الجلال والإکرام).

جا بەندە زۆر دەپاڕێتەوەو دووبارەی دەکاتەوە، وە ئیلحاح لە خوای گەورە دەکات بە دووبارە کردنەوەی پەروەردگارێتی(ربوبية) و پەرستراوێتی(ألوهية) و

---

(٢) سورة الأعراف، الآية: ٢٠٥.

(٣) بڕوانە: النهاية في غريب الحديث لابن الأثير ٤/٢٣٦، والمصباح المنير ص٥٥٠، والقاموس المحيط ص٣٠٦.

(٤) الترمذي برقم ٣٧٧٣-٣٧٧٥ وصححه الألباني في صحيح الترمذي ٣/١٧٢.

ئەسماء و صیفاتی، ئەمەیش لە گەورەترین هۆکارێکە بۆ وەڵامدانەوەی پاڕانەوە، هەروەك پێغەمبەری خوا(ﷺ) باسی کردووە.[1] وە فەرمویەتی:

"الرجل يطيل السفر أشعث أغبر يمد يديه إلى السماء يا ربِّ يا ربِّ"...الحديث. [2]

واتە: پیاوێك لە سەفەری دوورو درۆیژدایەو قژ ئاڵۆزکاوو تۆزاوییە دەستەکانی بڵند دەکات بەرەو ئاسمان و دەڵێت: یا رب یا رب.....

ئەمە بەڵگەیە لەسەر ئیلحاح کردن لە پاڕانەوەدا، هەر بۆیە پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرمویەتی: "يستجاب لأحدكم ما لم يعجل، فيقول: قد دعوت فلم يستجب لي".[3] واتە: وەڵامی پاڕانەوەی هەر یەکێك لە ئێوە دەدرێتەوە مادام پەلە نەکات و بڵێت: پاڕامەوە بەڵام وەڵام نەدرامەوە.

٧- تەوەسول بکات بۆ لای خوای گەورە بەو جۆرە تەوەسولانەی شەرعین:

(الوسيلة): لە زمانەوانی‌دا واتە نزیك بوونەوەو گوێڕایەڵی. وە ئەو شتەی دەکرێتە هۆکار بۆ گەیشتن بە شتێك و خۆی پیّ نزیك دەکرێتەوە لێی، دەوترێت: فلأنە کەس وەسیلەی بەکارهێنا بۆ لای خوا، واتە کردارێکی ئەنجامدا خۆی پیّ لە خوای گەورە نزیك کردەوە، دەوترێت: (وسَلَ فلان إلى الله تعالى بالعمل يَسِلُ وَسْلاً وتوسُّلاً وتوسيلاً) واتە: ویست و حەزی هەبوو، وە نزیك بووەوە خۆی لیّ نزیك کردەوە، واتە کارێکی ئەنجامدا بە هۆیەوە نزیك بویەوە لێی.[4]

راغبي الأصفهاني فەرمویەتی: (الوسيلة) هەوڵدانە بۆ گەیشتن بە شتێك بە حەزو ویستەوە. وە ئەمە تایبەت ترە لە (الوصيلة)، چونکە مانای حەز و ویستی

---

(١) بڕوانە: جامع العلوم والحكم لابن رجب ١/٢٦٩-٢٧٥.

(٢) مسلم برقم ١٠١٥.

(٣) البخاري مع الفتح ١١/١٤٠، ومسلم ٤/٢٠٩٥.

(٤) بڕوانە: النهاية في غريب الحديث لابن الأثير ٥/١٨٥، والقاموس المحيط ص١٣٧٩، والمصباح المنير ص٦٦٠

تێدایه، خوای گەورە دەفەموێت: ﴿..وَابْتَغُواْ إِلَيهِ الْوَسِيلَةَ..﴾[1]. واته: (له ڕێگەی هەموو هۆکارو کردەوەیەکی چاکەوە هەوڵ بدەن ڕەزامەندیی ئەو زاته بەدەست بهێنن)، وە ڕاستێتی وەسیله گرتن بۆ لای خوای گەورە چاودێری کردنی ڕێگاکەیەتی بە زانست و پەرستش و هەوڵدانه بۆ پله بەرزەکانی شەریعەت، کە ئەمیش وەك نزیك بوونەوە وایە، وە کەسی وەسیله بەکارهێنەر ئەو کەسەیە بە حەزو ئومێدەوە بەرەو خوای گەورە دەچێت.[2] وە مانای ئایەتی ﴿..وَابْتَغُواْ إِلَيهِ الْوَسِيلَةَ..﴾ واتە نزیك بوونەوە لێی بە ئەنجامدانی گوێڕایەڵییەکانی و کار کردن بەوەی کە ئەو پێی ڕازییە.[3]

**جۆری یەکەم:** تەوەسول کردن له پاڕانەوەدا بە ناوێك له ناوەکانی خوای گەورە یان صیفەتێك له صیفەتەکانی، وەك ئەوەی کەسی دوعاکار بڵێت: خوایە لێت دەپاڕێمەوە بەوەی کە تۆ (الرحمن الرحيم) و (اللطيف) و (الخبير) يت کە بمپارێزیت. یان بڵێیت: داوات لێ دەکەم بەو بەزەییەیەت کە هەموو شتێکی گرتۆتەوە کە ڕەحمم پێ بکەیت و لێم خۆش بیت.

لەبەر ئەوە خوای گەورە فەرمویەتی: ﴿وَلِلَّهِ الأَسْمَآءُ الْحُسْنَى فَادْعُوهُ بِهَا....﴾.[4] واتە: هەر بۆ خوایە هەموو ناوە جوان و پیرۆزەکان، جا (ئەی ئیمانداران) بەو ناوانە دۆعا و نزا بکەن و هاناو هاوار بۆ ئەو زاته بەرن،..

---

(١) سورة المائدة، الآية: ٣٥.

(٢) مفردات غريب ألفاظ القرآن ص٨٧١.

(٣) تفسير ابن كثير ٥٣/٢، وانظر: قاعدة جليلة في التوسل والوسيلة لشيخ الإسلام ابن تيمية، ص٥-١٦٠. والتوسل أنواعه وأحكامه للشيخ الألباني، ص٨-١٥٦.

(٤) سورة الأعراف، الآية: ١٨٠.

وه لـه پاڕانـهوهكانی سـلیمان پێغهمبـهر(علیه الصلاة والسلام) كـه خـوای گـهوره دهفهرموێت: ﴿وَقَالَ رَبِّ أَوْزِعْنِي أَنْ أَشْكُرَ نِعْمَتَكَ الَّتِي أَنْعَمْتَ عَلَيَّ وَعَلَى وَالِدَيَّ وَأَنْ أَعْمَلَ صَالِحًا تَرْضَاهُ وَأَدْخِلْنِي بِرَحْمَتِكَ فِي عِبَادِكَ الصَّالِحِينَ﴾.[١]

واتـه: سـولهیمان (كـه گـوێی لـه هـاواری مێروولهكـه بـوو) زهردهخهنـه گرتـی و پێكـهنی بـه هـاوارو قسـهكهی، بۆیـه وتـی: پـهروهردگارا، یارمـهتیم بـده دڵ و دهروون و ڕۆح وگیانم كۆبكهرهوه، تا سوپاسگوزاری نازو نیعمهتـهكانت بم كه بهسـهر مـن و دایـك وباوكمـدا ڕژاندووتـه، هـهروهها كۆمـهكیم بكـه تـا كـاروكردهوهی چاكه ئـهنجام بـدهم كـه تـۆ پێـی ڕازیـی بیـت و بـه ڕهحمـهت و میهرهبانی خۆت بمخهره ڕیزی بهنده چاكهكانتهوه.

عن عبد الله بن بريدة عن أبيه أن رسول(ﷺ) سمع رجلاً يقول: "اللهم إني أسألك بأني أشهد أنك أنت الله لا إله إلا أنت، الأحد الصمد الذي لم يلد ولم يولد، ولم يكن له كفواً أحد" قال فقال: "والذي نفسي بيده لقد سأل الله باسمه الأعظم الذي إذا دُعي به أجاب، وإذا سُئل به أعطى"[٢]. وفي رواية: "لقد سألت الله عز وجل باسمه الأعظم".

واتـه: پێغهمبـهری خـوا(ﷺ) گـوێی لـه پیاوێـك بـوو دهیـووت: "اللهم إني أسألك بأني أشهد أنك أنت الله لا إله إلا أنت، الأحد الصمد الذي لم يلد ولم يولد، ولم يكن له كفواً أحد" فهرموی: سوێند بهو خوایهی نهفسی منی به دهسته له خوای گهوره پاڕایهوه به ناوه گهورهكهی كه ئهگهر كهسێك پێی بپاڕێتهوه وهڵام دهدرێتهوهو ئهگهر داوای پیٚ بكات پێی دهبهخشێت.

له ڕیوایهتهكهی تردا: تۆ له خوای گهوره پاڕایتهوه به ناوه گهورهكهی.

---

(١) سورة النمل، الآية: ١٩.

(٢) أبو داود ٢/٧٩، والترمذي ٥/٥١٥، وأحمد ٥/٢٦٠، وابن ماجه ٢/١٢٦٧، والحاكم ١/٦٠٤، وقال: صحيح على شرط الشيخين، ووافقه الذهبي، وابن حبان وصححه الألباني في صحيح الترمذي ٣/١٦٣.

وعن أنس بن مالك(رضي الله عنه) أنه كان مع رسول الله(ﷺ) جالساً ورجل يصلي ثم دعا "اللهم إني أسألك بأن لك الحمد لا إله إلا أنت المنان، بديع السماوات والأرض، يا ذا الجلال والإكرام، يا حي يا قيوم". فقال النبي(ﷺ): "لقد دعا الله باسمه العظيم الذي إذا دُعي به أجاب وإذا سُئل به أعطى".(١)

واته: ئەنەسی کوڕی مالیك(ڕەزای خوای لێ بێت) لە خزمەتی پێغەمبەری خوا(ﷺ)دا دانیشتبوو، کابرایەك نوێژی کردو پاشان پاڕایەوە ووتی: "اللهم إني أسألك بأن لك الحمد لا إله إلا أنت المنان، بديع السماوات والأرض، يا ذا الجلال والإكرام، يا حي يا قيوم" پێغەمبەریش(ﷺ) فەرمووی: لە خوای گەورە پاڕایەوە بەو ناوە گەورەیەی کە ئەگەر هەر کەسێك پێی بپاڕێتەوە وەڵام دەدرێتەوە، وە ئەگەر پێی داوا بکرێت پێی دەبەخشرێت.

وعن محجن بن الأدرع أن رسول الله(ﷺ) دخل المسجد فإذا هو برجل قد قضى صلاته وهو يتشهد، وهو يقول: "اللهم إني أسألك يا الله الواحد الأحد الصمد الذي لم يلد ولم يولد ولم يكن له كفواً أحد، أن تغفر لي ذنوبي إنك أنت الغفور الرحيم". فقال رسول الله(ﷺ): "قد غفر له، قد غفر له، قد غفر له" ثلاث مرات.(٢)

واته: پێغەمبەری خوا(ﷺ) چووە مزگەوت بینی پیاوێك لە کۆتایی نوێژدایەو لە دوای تەحییاتەوە دەڵێت: "اللهم إني أسألك يا الله الواحد الأحد الصمد الذي لم يلد ولم يولد ولم يكن له كفواً أحد، أن تغفر لي ذنوبي إنك أنت الغفور الرحيم". پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرمووی: خوا لێی خۆش بوو ، خوا لێی خۆش بوو، خوا لێی خۆش بوو.

---

(١) أبو داود بلفظه ٨٠/٢ وابن ماجه ١٢٦٨/٢ والترمذي ٥٥٠/٥ وأحمد ١٢٠/٣، والنسائي ٥٢/٣ وصححه ابن حبان برقم ٢٣٨٢ (موارد) والحاكم ٥٠٣/١ ووافقه الذهبي وهو كما قالا، وصححه الألباني في صحيح النسائي ٢٧٩/١.

(٢) أحمد ٣٣٨/٤ والنسائي ٥٢/٣ وأبو داود، وصححه الألباني في صحيح النسائي ٢٨٠/١، وصحيح أبي داود ١٨٥/١.

وعن سعد قال: قال رسول الله(ﷺ): "دعوة ذي النون إذ دعا وهو في بطن الحوت: لا إله إلا أنت سبحانك إني كنت من الظالمين، فإنه لم يدع بها رجل مسلم في شيء قط إلا استجاب الله له".[١]

واته: پاڕانەوەكەی (ذي النون) (یونس پێغەمبەر(علیه الصلاة والسلام) كە كاتێك لە سكی حوتەكەدا بوو فەرموی: (لا إله إلا أنت سبحانك إني كنت من الظالمين) هیچ پیاوێكی موسڵمان نییە كە پێی بپاڕێتەوە بۆ هەر شتێك، ئیلا خوای گەورە وەڵامی دەداتەوە.

**جۆری دووەم:** تەوەسول كردن بۆ لای خوای گەورە بە كردارێكی چاك كە كەسی دوعاكار كردبێتی: وەك ئەوەی كەسی موسڵمان بڵێت: (اللهم بإيماني بك، أو محبتي لك، أو اتباعي لرسولك أن تغفر لي). خوایە داوات لێ دەكەم بە ئیمانم بە تۆ، یان خۆشەویستیم بۆ تۆ، یان شوێنكەوتنم بۆ پێغەمبەرەكەت كە لێم خۆش بیت.

یان بڵێت: خوایە لێت دەپاڕێمەوە بە خۆشەویستیم بۆ محمد(ﷺ)، وە بە بڕوابوونم پێی، كە دەروم لێ بكەیتەوە. وە لەوانە كەسەكە باسی كردەوەیەكی چاكی شایستەی خۆی بكات لە دوعاكەدا كە ترسی خواو تەقواو ڕەزامەندی خوای گەورەو پێشخستنی ڕەزامەندی ئەو بەسەر هەموو شتێكداو گوێڕایەڵی بۆی تێدا بێت، پاشان لە پاڕانەوەكەیدا بیكاتە وەسیلە بۆ لای خوا تا ئومێدی گیرا بوون و وەڵامدانەوەی زیاتر بێت. بەڵگەش لەسەر دروستی ئەمە: خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿الَّذِينَ يَقُولُونَ رَبَّنَآ إِنَّنَا آمَنَّا فَاغْفِرْ لَنَا ذُنُوبَنَا وَقِنَا عَذَابَ النَّارِ﴾.[٢]

---

(١) الترمذي ٥/٥٢٩، وأحمد ١/١٧٠، والحاكم وصححه ووافقه الذهبي ١/٥٠٥، قال الأرنؤوط في تخريجه للكلم ص٨٦ وهو كما قالا وحسنه ابن حجر، وصححه الألباني في صحيح الترمذي ٣/١٦٨.

(٢) سورة آل عمران، الآية: ١٦.

واتـە: ئەوانـەی کـە دەڵـێن: پـەروەردگارا، بەڕاسـتی ئێمـە ئیمـان و باوەڕمـان هێناوە، دە لە گوناهەکانمان خۆش ببە و لە ئاگری دۆزەخ بمانپارێزە.
وە دەفەرموێت: ﴿رَبَّنَآ آمَنَّا بِمَآ أَنزَلَتْ وَاتَّبَعْنَا الرَّسُولَ فَاكْتُبْنَا مَعَ الشَّاهِدِينَ﴾.[1]
واتە: (ئەوسا وتیان): پەروەردگارا ئێمە باوەڕمان هێناوە، بەوەی داتبەزاندووە و ڕەوانـەت کـردووە، شـوێنکەوتەی پێغەمبەرەکەشـتین، دە تـۆیش لـە ڕیـزی شایەتەکانی (گەیاندنی بەرنامەکەتدا) تۆمارمان بکە.
وە هەروەها بەسەرهاتی هاوەڵانی ئەشکەوت کە هەریەکیان باسی کردارێکی چاکی خۆی کرد کە تەنها لەبەر خاتری خوای گەورە ئەنجامی دابوو، جا ئەو کردەوە چاکەیان دەکردە وەسیلەو خوای گەورەش وەڵامی دەدانەوە.[2]
**جۆری سیٚ یـەم:** تەوەسـول کـردن بۆ لای خـوای گـەورە بـە پاڕانـەوەی پیـاوێکی صاڵحی زیندووی ئامادە:
وەك ئەوەی موسڵمانێك بکەوێتـە ناڕەحەتییـەکی زۆرەوە، یـان موصـیبەتێکی گـەورە بێـت بـە سـەریداو خـۆی بـە کەمتەرخـەم و گوناهبـار بزانێـت لـە بەجێگەیاندنی مافەکانی خوای گەورەدا بەسەرییەوەو حـەز بکـات هۆکـارێکی بەهێزتر بگرێتە بەر بۆ لای خوای گەورە، بۆیە بچێت بۆ لای پیاوێك کە چاکەو تەقوا، یان فەزڵ و زانست بـە قورئـان و سـوننەتی تێدا شـك بـەرێت و داوای لیٚ بکـات کـە بـۆی بپاڕێتـەوە تـا خـوای گـەورە ناڕەحەتییەکـەی لەسـەر لاببـات و غەمەکەی نەهێڵێت، بەڵگەش:
ما رواه أنس بن مالك(رضي الله عنه) قال: أصابت الناس سَنَةٌ على عهد النبي(ﷺ)، فبينما النبي(ﷺ) يخطب في يوم الجمعة قام أعرابي فقال: يا رسول الله! هلك المال وجاع العيال فادع الله لنا. فرفع يديه ثم قال: "اللهم أغثنا، اللهم أغثنا، اللهم أغثنا" وما

---

(١) سورة آل عمران، الآية: ٥٣.
(٢) أخرجه البخاري ٤/٣٧ ومسلم ٤/٢٠٩٩.

نرى في السماء قَزَعةً، فوالذي نفسي بيده ما وضعها حتى ثار السحاب أمثال الجبال، ثم لم ينزل من منبره حتى رأيت المطر يتحادر عن لحيته(ﷺ)، فمطرنا يومنا ذلك، ومن الغد، وبعد الغد، والذي يليه، حتى الجمعة الأخرى، وقام ذلك الأعرابي أو قال غيره فقال: يا رسول الله، تهدم البناء، وغرق المال، فادع الله لنا، فرفع يديه فقال: "اللهم حوالينا ولا علينا" فما يشير بيده إلى ناحية من السحاب إلا انفرجت وصارت المدينة مثل الجوبة، وسال الوادي قناة شهراً ولم يجيء أحد من ناحية إلا حدَّث بالجود".[١]

واته: خەڵكی لەسەردەمی پێغەمبەری خوادا(ﷺ) ووشكە ساڵیەك ڕووی تێ كردن، ئینجا كاتێك لە ڕۆژی جومعەدا پێغەمبەری خوا(ﷺ) ووتاری دەدا ئەعرابیەك بە پێوە وەستاو ووتی: ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ)، سەروەت و سامانمان بە هیلاكدا چووەو كەسوكارمان تەواو برسی بوون، لە خوای گەورە بۆمان بپاڕێرەوە. ئەویش دەستەكانی بەرز كردەوەو فەرموی: "اللهم أغثنا، اللهم أغثنا، اللهم أغثنا" وە ئێمە لە ئاسماندا پارچە هەورێكی بچوكمان شك نەدەبرد، سوێند بەو خوایەی نەفسی منی بە دەستە پێغەمبەر(ﷺ) دەستەكانی دانەنا هەتا هەورەكان بەوێنەی چیاكان هاتن و پاشان لە مینبەرەكەی دانەبەزی هەتا بینیم باران لە ڕیشییەوە دادەچۆڕێت، ئەو ڕۆژە باران بوو وە سبەینێو دوو سبەیش، هەتا جومعەی داهاتوو، ئەو ئەعرابیە یان غەیری ئەو بە پێوە وەستاو ووتی: ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) بیناكان ڕووخان سامانمان نوقم بوو، لە خوای گەورە بپاڕێرەوە بۆمان. ئەویش دەستەكانی بەرز كردەوەو فەرموی: "اللهم حوالينا ولا علينا" جا ئاماژەی نەدەكرد بۆ هیچ بەشێكی هەورەكە ئیلا هەورەكە لادەچوو، شارەكە ڕووناك بویەوە. ئاوی دۆڵەكە یەك مانگ جۆگەلەی بەست، وە هیچ كەسێك لە هیچ لایەكەوە نەدەگەڕایەوە ئیلا باسی خێرو خۆشی دەكرد.

---

(١) أخرجه البخاري ١/٢٢٤، ومسلم ٢/٦١٢ برقم ٨٩٧.

وه هـەر لەمانـە داواكردنـی ئـەبوهورەیرە(ڕەزای خـوای لێ بێـت) لـە پێغەمبــەری خوا(ﷺ) كە بپاڕێتەوە بۆ دایكی هەتا خوای گەورە ڕێنمایی بكات بۆ ئیسلام، پێغەمبەریش(ﷺ) بۆی پاڕایەوەو خوای گەورەش هیدایەتی دا.[1]

وە لەوانە عومەری كوڕی خەتتاب(ڕەزای خوای لێ بێت) داوای لە عەبباسی مامی پێغەمبەر دەكرد(ﷺ) كە لە خوای گەورە بپاڕێتەوە كە بارانیان بۆ بباریێنێت، خوای گەورەش بۆی دەباراندن.[2]

هـەروەها فەرمودەكـەی پێغەمبـەری خـوا(ﷺ) كـە بـە عومـەری دەفـەرموو(ڕەزای خوای لێ بێت): "يأتي عليكم أويس بن عامر مع أمداد أهل اليمن من مراد ثم من قرن، كان به برص فبرأ منه إلا موضع درهم، له والدة هو بها بر، لو أقسم على الله لأبره، فإن استطعت أن يستغفر لك فافعل".[3]

واتــە: وەیســی كــوڕی عــامر لەگــەڵ كۆمــەڵێك لــە خــەڵكی یەمــەن كــە لــە (موراد)پاشـان لـە (قـرن)ن دێنـە لاتـان، ئـەو پیـاوە نەخۆشـی بەڵـەكی هـەبووە خوای گەورە شیفای داوەو تەنها بە ئەندازەی درهەمێكی پێوە ماوە، دایكێكی هەیـەو ئـەم لەگەڵی‌دا زۆر چاكە، ئەگـەر سـوێند لەسـەر خـوای گـەورە بخـوات خوای گەورە بۆی جێبـەجێ دەكات، جا ئەگـەر توانیـت پێـی بگـەیت و داوای لێخۆشبوونت بۆ بكات لە خوای گەورە، ئەوا بیكە.

٨ ـ دان نان(الإعتراف) بە تاوان و نیعمەتەكاندا لەسەرت لە كاتی پاڕانەوەدا:

عن شداد بن أوس(رضي الله عنه) عن النبي(ﷺ) قال: سيد الاستغفار أن تقول: " اللهـمَّ أنتَ رَبِّي لآ إلهَ إلاّ أنتَ خَلَقْتَني وَأنا عَبدُكَ، وَأنا على عَهْدِكَ وَوَعْدِكَ ما استَطَعْتُ. أعوذُ

---

(١) مسلم ٤/١٩٣٩ ويأتي تخريجه في ص١٠٧.

(٢) بڕوانە: البخاري مع الفتح ٢/٤٩٤ كتاب الاستسقاء باب سؤال الناس الإمام الاستسقاء إذا قحطوا. حديث رقم ١٠٠٨.

(٣) أخرجه مسلم ٤/١٩٦٨، برقم ٢٥٤٢.

بِكَ مِنْ شرِّ ماصَنَعْتُ. أبوءُ لَكَ بِنِعمَتِكَ عَلَيَّ وَأبوءُ بَذنبي. فاغفِر لي فإنَّهُ لا يَغفِرُ الذُّنوبَ إلاّ أنتَ ". قال: "ومن قالها من النهار موقناً بها فمات من يومه قبل أن يمسي فهو من أهل الجنة، ومن قالها من الليل وهو موقن بها فمات قبل أن يصبح، فهو من أهل الجنة". [1]

**واته: خوايه تۆ پەروەردگارمی هیچ پەرستراوێك نىيە بە هەق جگە لە تۆ. بەديت هێناوم و من بەندەی تۆم و من لەسەر ئەو پەيمان و بەڵێنەمم كە بە تۆم داوە (لە ئيمان و ئيخلاص) تا بتوانم. (مەبەست پێی ئەو پەيمانەيە كە خوای گەورە لە نەوەكانی ئادەمی وەرگرت و لە سورەتی الأعراف ئايەتی(١٧٢)باسكراوە)، پەنات پێ دەگرم لەخراپەی ئەوەی ئەنجامم داوە لە گوناه. دان ئەنێم بە نيعمەتەكانتدا لەسەرم و دان ئەنێم بە گوناهەكانم دا. دە سا خوايە لێم خۆش بە ، چونكە بە ڕاستی كەس لە گوناه خۆش نابێ جگە لە تۆ.**

**٩ـ زۆر لە خۆنەكردن بۆ ڕێكخستنی سەروا(السَّجع) لە كاتی پاڕانەوەدا:**

عن ابن عباس قال: حدث الناس كل جمعة مرة، فإن أبيت فمرتين، فإن أبيت فثلاث مرار، ولا تمل الناس هذا القرآن، ولا ألفينك تأتي القوم وهم في حديث من حديثهم فتقص عليهم فتقطع عليهم حديثهم فتملهم، ولكن أنصت فإذا أمروك فحدثهم وهم يشتهونه، فانظر السجع من الدعاء فاجتنبه، فإني عهدت رسول الله(ﷺ) وأصحابه لا يفعلون إلا ذلك – يعني لا يفعلون إلا ذلك الاجتناب –. [2]

**واته: لە ئيبن عەبباسەوە(ڕەزای خوای لێ بێت) فەرمويەتی: ووتارو ئامۆژگاری خەڵكی بكە هەموو هەفتەيەك جارێك، ئەگەرنا دوو جار، ئەگەر ويستت سێ جار، وە خەڵكی بێ تاقەت و وەڕست مەكە لەم قورئانە، وە نەكەيت بچيتە لای**

---

(١) البخاري ٧/١٤٤ و١٥٠ برقم ٦٣٠٦ والترمذي ٥/٤٦٧، والنسائي ٨/٢٧٩، في الاستعاذة باب الاستعاذة من شر ما صنع وأحمد ٤/١٢٢.

(٢) البخاري ٧/١٩٧، برقم ٦٣٣٧.

گەلێك كە لە گەرمەی قسە كردندا بوون، تۆش قسەیان بۆ بكەیت و قسەكەیان پێ ببڕیت، وە وەڕست و بێ تاقەتیان بكەیت. بەڵام گوێ بگرە ئەگەر ڕێیان پێ دایت قسەیان بۆ بكە لەو كاتەدا كە حەزی لێ دەكەن، وە خۆت بپارێزە لە زۆر لە خۆ كردنی ڕێكخستن لە پاڕانەوەدا، چونكە من بیستومە پێغەمبەری خوا(ﷺ) و هاوڵانی(ڕەزای خوایان لێ بێت) هەر ئەوەیان دەكرد، واتە خۆیان دەپاراست لێی.

١٠ ـ سێ بارەكردنەوەی پاڕانەوەكە:

عن عبد الله بن مسعود(رضي الله عنه) أن النبي(ﷺ) كان يصلي عند البيت، وأبو جهل وأصحابٌ له جلوس. إذ قال بعضهم لبعض: أيكم يجيء بسلا جزور بني فلان فيضعه على ظهر محمد إذا سجد، فانبعث أشقى القوم فجاء به، فنظر حتى إذا سجد النبي(ﷺ) وضعه على ظهره بين كتفيه، وأنا أنظر لا أغني شيئاً لو كان لي منعة. قال: فجعلوا يضحكون ويميل بعضهم على بعض، ورسول الله(ﷺ) ساجد لا يرفع رأسه، حتى جاءته فاطمة فطرحته عن ظهره، فرفع رأسه ثم قال: "اللهم عليك بقريش" ثلاث مرات. فشق عليهم إذ دعا عليهم قال: وكانوا يرون أن الدعوة في ذلك البلد مستجابة ثم سمى: "اللهم عليك بأبي جهل، وعليك بعتبة بن ربيعة، وشيبة بن ربيعة، والوليد بن عتبة، وأمية بن خلف، وعقبة بن أبي معيط". وعد السابع فلم نحفظه قال: فوالذي نفسي بيده لقد رأيت الذين عَدّ رسول الله(ﷺ) صرعى في القليب. قليب بدر.[1]

واتە: پێغەمبەری خوا(ﷺ) لە لای كەعبەدا نوێژی دەكرد وە ئەبو جەهل و هەندێك لە هاوەڕێكانی دانیشتبوون، هەندێكیان بە هەندێكیان ووت: كامتان دەچن ئەو ناوسك و ڕیخۆڵانەی نەوەی فلان فڕێی داوە بیهێنێت و بیخاتە

(١) أخرجه البخاري ١/٧٤ في كتاب الوضوء باب إذا ألقي على ظهر المصلي جيفة لم تفسد صلاته برقم ٢٤٠، ومسلم ١٤١٨/٣ كتاب الجهاد والسير باب ما لقي النبي(ﷺ) من أذى المشركين والمنافقين حديث رقم ١٧٩٤.

سەر پشتی محمد(ﷺ) کاتێ سەجدەی برد؟ نەگبەتترینی ئەو کۆمەڵە هەستاو چوو هێنای و چاوەڕێی کرد هەتا پێغەمبەری خوا(ﷺ) سەجدەی برد، ئەو کات خستیە سەر پشتیو نێوان هەردوو شانی، منیش تەماشام دەکردو هیچ توانایەکم نەبوو. فەرموی: ئەوانیش پێدەکەنین و لار دەبوونەوە بەسەر یەکدا، وە پێغەمبەری خواش(ﷺ) لەسەجدەدا بوو، سەری بەرز نەکردەوە هەتا فاتیمە(ڕەزای خوای لێ بێت) هات و لەسەر پشتی لابردو فڕێی دا، پێغەمبەری خوا(ﷺ) سەری بەرز کردەوەو پاشان فەرموی: "اللهم عليك بقريش" خوایە قوڕەیش لەناوبەرە، سێ جار. ئەوانیش ئەمەیان بە لاوە زۆر قورس بوو کە لێیان پاڕایەوە چونکە پێیان وابوو پاڕانەوە لەم شارەدا گیرایە، پاشان ناوی هێنان و فەرموی: "اللهم عليك بأبي جهل، وعليك بعتبة بن ربيعة، وشيبة بن ربيعة، والوليد بن عتبة، وأمية بن خلف، وعقبة بن أبي معيط". خوایە ئەبی جەهل و عوتبەی کوڕی ڕەبیعەو شەیبەی کوری رەبیع و وەلیدی کوری عوتبەو ئومەییەی کوری خەلەف و عوقبەی کوری ئەبی معیط لەناوبەرە. پاشان حەوتەمیشی ووت، بەڵام من بۆم لەبەر نەکرا. دەفەرموێت: سوێند بەو خوایەی نەفسی منی بە دەستە ئەو کەسانەی کە پێغەمبەری خوا(ﷺ) ناوی هێنان و لێیان پاڕایەوە بە کوژراوی بینیمن لە چاڵەکانی بەدردا.

١١ـ ڕوو کردنە قیبلە:

عن عبد الله بن زيد قال: خرج النبي(ﷺ) إلى هذا المصلى يستسقي فدعا واستسقى، ثم استقبل القبلة وقلب رداءه.(١)

واتە: پێغەمبەری خوا(ﷺ) هاتە دەرەوە بەرەو ئەم نوێژگەیە بۆ نوێژە بارانەو داوای باران بارین کردن لە خوای گەورە جا پاڕایەوەو داوای کرد، پاشان ڕووی کردە قیبلەو پۆشاکەکەی بەری هەڵگێڕایەوە.

---

(١) أخرجه البخاري بلفظ ٩٩/٧، برقم ٦٣٤٣ في كتاب الدعوات باب الدعاء مستقبل القبلة.

**١٢ . دەست بەرز کردنەوە لە پاڕانەوەدا:**

قال أبو موسى الأشعري(رضي الله عنه): دعا النبي(ﷺ) ثم رفع يديه، ورأيت بياض إبطيه.(١)

**واتە: پێغەمبەری خوا(ﷺ) پاڕایەوە پاشان دەستەکانی بەرز کردەوەو سپیایی بن باڵەکانیم بینی.**

وقال ابن عمر: رفع النبي(ﷺ) يديه وقال: "اللهم إني أبرأ إليك مما صنع خالد".(٢)

**واتە: پێغەمبەری خوا(ﷺ) دەستەکانی بەرز کردەوەو فەرموی: خوایە من بەرائەتی خۆم دەرئەبڕم بۆ لای تۆ لەوەی کە خالید ئەنجامی داوە.**

وعن أنس أن النبي(ﷺ) رفع يديه حتى رأيت بياض إبطيه.(٣)

**واتە: پێغەمبەری خوا(ﷺ) دەستەکانی بەرز کردەوە هەتا سپیایی بن باڵەکانیم بینی.**

وعن سلمان(رضي الله عنه) قال: قال رسول الله(ﷺ): "إن ربكم تبارك وتعالى حييٌّ كريم، يستحي من عبده إذا رفع يديه إليه أن يردهما صفراً".(٤)

**واتە: پەروەردگاری پاك و بەرزی ئێوە بەشەرم و بەخشندەیە، شەرمی لێ دێت کاتێك بەندەیەکی هەردوو دەستی بۆ بەرزبکاتەوەو بپاڕێتەوە کە بەبێ ئومێدی و بە بەتاڵی بگەڕێنێتەوە.**

---

(١) البخاري ١٩٨/٧ كتاب الدعوات باب رفع الأيدي في الدعاء قبل رقم ٦٣٤١.

(٢) البخاري ١٩٨/٧ كتاب الدعوات باب رفع الأيدي في الدعاء قبل رقم ٦٣٤١.

(٣) البخاري ١٩٨/٧ كتاب الدعوات باب رفع الأيدي في الدعاء قبل رقم ٦٣٤١.

(٤) أبو داود ٧٨/٢ والترمذي ٥٥٧/٥ وغيرهما وقال ابن حجر سنده جيد، وصححه الألباني في صحيح الترمذي ١٧٩/٣.

**١٣ . دەستنوێژ شتن پێش پاڕانەوە ئەگەر توانراو ئاسان بوو:**[(١)]

عن أبي موسى(رضي الله عنه) قال: لما فرغ النبي(ﷺ) من حنين بعث أبا عامر على جيش إلى أوطاس، فلقي دريد بن الصمة فقتل دريد وهزم الله أصحابه. قال أبو موسى: وبعثني مع أبي عامر فرُمِيَ أبو عامر في ركبته. رماه جشميٌّ بسهم فأثبته في ركبته فانتهيت إليه، فقلت: يا عم من رماك؟ فأشار إلى أبي موسى فقال: ذاك قاتلي الذي رماني، فقصدت له فلحقته، فلما رآني ولَّى فاتبعته وجعلت أقول له: ألا تستحي ألا تثبت فكف. فاختلفنا ضربتين بالسيف فقتلته، ثم قلت لأبي عامر: قتل الله صاحبك قال: فانزع هذا السهم فنزعته فنزا منه الماء فقال: يا ابن أخي ! انطلِقْ إلى رسول الله(ﷺ) فأقرئهُ منِّي السلام، وقل له: يقول لك أبو عامر: استغفر لي. قال: واستعملني أبو عامر على الناس فمكث يسيراً ثم مات، فرجعت فدخلت على النبي(ﷺ) في بيته على سرير مُرْمَلٍ وعليه فراش قد أثر رمال السرير في ظهره وجنبه. فأخبرته بخبرنا وخبر أبي عامر وقلت له: قال: قل له: استغفر لي، فدعا رسول الله(ﷺ) بماءٍ فتوضأ منه ثم رفع يديه فقال: "اللهم اغفر لعبيد أبي عامر" ورأيت بياض إبطيه ثم قال: "اللهم اجعله يوم القيامة فوق كثير من خلقك، أو من الناس". فقلت: ولي يا رسول الله، فاستغفر، فقال: "اللهم اغفر لعبد الله ابن قيس ذنبه وأدخله يوم القيامة مُدْخَلاً كريماً"[(٢)].

**واتە: کاتێ پێغەمبەری خوا(ﷺ) لە جەنگی حونەین تەواو بوو، (أبا عامر)ی بە سەرکردەی سوپایەك ڕەوانەی اوطاس کرد، لەوێ گەیشت بە (دورەیدی کوری صەمە) دورەید کوژراو خوای گەورە سوپاکەی شکاندن. ئەبو موسا دەفەرموێت: وەپێغەمبەری خوا(ﷺ) لەگەڵ ئەبی عامر ناردمی، جا تیرێك بەر ئەژنۆی ئەبو عامر کەوت، کە کابرایەکی جەشمی بە کەوانەکەی تێی گرت و**

---

(١) دەستنوێژ شتن پێش پاڕانەوە موستەحەبە، وە پێغەمبەری خواش(ﷺ) لەسەر هەموو حاڵێکی زیکری خوای دەکرد، بە پێی ئەمەش پاڕانەوەی کەسی لەش گران دروستە، بەڵام نابێ هیچ قورئان بخوێنێت هەتا خۆی دەشوات.

(٢) أخرجه البخاري ١٠١/٥ ومسلم ١٩٤٣/٤، وانظر: الفتح فهناك فوائد ٤٢/٨.

نای به ئەژنۆیەوەو پێکای، منیش گەیشتمە سەری‌و پێم ووت: ئەی مامە کێ تیری تێ گرتیت؟ ئەویش ئاماژەی بۆ ئەبو موسا کردو ووتی: ئەوە بکوژی منەو تێی گرتم. منیش شوێنی کەوتم، کاتێ منی بینی پشتی هەڵکرد، منیش شوێنی کەوتم و پێم دەوت: ئایا شەم ناکەیت، ئایا ڕانەوەستیت؟ ئەویش وەستاو بە شمشێر ئامبازی یەك بوین منیش کوشتم. پاشان بە ئەبی عامرم ووت: خوای گەورە دوژمنەکەتی لەناو برد. وتی: دە وەرە ئەم تیرە دەربێنە منیش دەرم هێناو ئاوی لێ دەر دەهات، ووتی: ئەی کوڕی برام بچۆ بۆ لای پێغەمبەری خوا(ﷺ) و سەلامی منی پێ بگەیەنەو پێی بڵێ: ئەبو عامر دەیوت: داوای لێخۆشبوونم بۆ بکات، دەفەرموێت: وە ئەبو عامر منی کردە ئەمیر بەسەر خەڵکەکەوە، ئەوەندەی پێنەچوو پاشان مرد. منیش گەڕامەوەو چومە خزمەتی پێغەمبەری خوا(ﷺ) کە لەماڵەوە لەسەر جێگایەکی لمین ڕاکشابوو، پۆشاکێکی دابوو بە خۆی‌دا شوێنەواری لمەکە لە پشت و لا تەنیشتی‌دا دەرچوو بوو، منیش هەواڵی خۆمان و ئەبی عامرم پێ گەیاندوو ووتم: وتویەتی پێی بڵێ داوای لێخۆشبوونم بۆ بکات. پێغەمبەری خوا(ﷺ) داوای ئاوی کردو دەستنوێژی پێ گرت و پاشان دەستەکانی بەرز کردەوەو فەرموی: خوایە لە بەندەت ئەبی عامر خۆش ببە. وە سپیایی بن باڵەکانیم بینی. پاشان فەرموی: خوایە لە ڕۆژی قیامەتدا بیخەرە سەروی زۆرێك لە دروست کراوەکانت، یان زۆرێك لە خەڵکی. منیش ووتم: بۆ منیش ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) داوای لێخۆشبوونم بۆ بکە. فەرموی: خوایە لە گوناهی عبدالله ی کوڕی قەیس خۆشبەو لە ڕۆژی قیامەتدا بە چوونە ژوورەوەیەکی ڕێزلێ گیراو بیخەرە ژوورەوە.

١٤ـ گریان له پاڕانەوەدا له ترسی خوای گەورە:

عن عبد الله بن عمرو(رضي الله عنهما) أن النبي(ﷺ) تلا قول الله عز وجل في إبراهيم: ﴿رَبِّ إِنَّهُنَّ أَضْلَلْنَ كَثِيرًا مِّنَ النَّاسِ فَمَن تَبِعَنِي فَإِنَّهُ مِنِّي﴾[1]. وقول عيسى: ﴿إِن تُعَذِّبْهُمْ فَإِنَّهُمْ عِبَادُكَ وَإِن تَغْفِرْ لَهُمْ فَإِنَّكَ أَنتَ الْعَزِيزُ الْحَكِيمُ﴾[2]. فرفع يديه وقال: "اللهم أمتي أمتي وبكى" فقال الله عز وجل: "يا جبريل اذهب إلى محمد – وربك أعلم – فسله ما يبكيك؟ فأتاه جبريل عليه الصلاة والسلام فسأله، فأخبره رسول الله(ﷺ) بما قال. وهو أعلم، فقال الله: يا جبريل اذهب إلى محمد فقل: إنا سنرضيك في أمتك ولا نسوءُك".[3]

واتە: پێغەمبەری خوا(ﷺ) ووتەی خوای گەورەی لە زمانی ئیبراهیم پێغەمبەرەوە(عليه الصلاة والسلام) دەخوێندەوە کە فەرمووبووی(رَبِّ إِنَّهُنَّ أَضْلَلْنَ كَثِيرًا مِّنَ النَّاسِ فَمَن تَبِعَنِي فَإِنَّهُ مِنِّي..)(واتە: پەروەردگارا، بەڕاستی ئەو بتانە زۆر کەسیان گومڕا کردو، زۆر خەڵکیان سەرلێشێواو کرد، جا ئەوەی شوێنی من بکەوێت و بەگوێی من بکات، ئەوە بێگومان لە پەیڕەوانی منە).

وە دەربارەی ووتەی عیسا پێغەمبەر(عليه الصلاة والسلام) کە فەرمووبووی (إِن تُعَذِّبْهُمْ فَإِنَّهُمْ عِبَادُكَ وَإِن تَغْفِرْ لَهُمْ فَإِنَّكَ أَنتَ الْعَزِيزُ الْحَكِيمُ)(واتە: جا ئەگەر ئەشکەنجەیان بدەیت (لەسەر لادان و تاوانیان)، ئەوە بەڕاستی بەندەی خۆتن و ئەگەر لێشیان خۆش ببیت، ئەوە بەڕاستی تۆ خۆت خوایەکی باڵادەست و دانایت (دەزانیت کێ شایستەی لێخۆشبوونە).

پاشان دەستەکانی بەرز کردەوەو فەرمووی: خوایە ئوممەتەکەم ئوممەتەکەم..وە گریا..خوای گەورە فەرمووی: ئەی جبریل بچۆ بۆ لای محمد(ﷺ) – وە پەروەردگارت زاناترە بۆچی دەگری– پێ ی بڵێ: چی

(١) سورة إبراهيم، الآية: ٣٦.

(٢) سورة المائدة، الآية: ١١٨.

(٣) مسلم ١/١٩١ كتاب الإيمان باب دعاء النبي (ﷺ) لأمته وبكائه شفقة عليهم.

دەتگریـــەنێت؟ وە جـــوبریلیش(u) هـــات و پرســـیاری لێ کـــرد؟ پێغەمبـــەری خـوا(ﷺ) هـەواڵی پێـدا بـەوەی کـە ووتویـەتی و خـوای گـەورە زانـاترە، خـوای گەورە فەرموی: ئەی جبریل بڕۆ بۆ لای محمد و پێی بڵێ: ئێمە ڕازیـت دەکـەین بەرامبەری ئوممەتەکەت و دڵ شکاوت ناکەین.

١٥ ـ دەرخستنی هەژاری و شەکوای حاڵ بۆ لای خوای گەورە: خـوای گـەورە دەفەرموێت: ﴿وَأَيُّوبَ إِذْ نَادَى رَبَّهُ أَنِّي مَسَّنِيَ الضُّرُّ وَأَنتَ أَرْحَمُ الرَّاحِمِينَ﴾[1].

واتـە: یـادی – ئـەیوب– یـش بکـە کاتێك هانـاو هـاواری بـۆ پـەروەردگاری بـرد (دوای ئەوەی ماوەیەکی دوورو درێژ نەخۆش کەوتبوو، جگـە لـەوە پێشـتریش مـاڵ و سـامان ومنداڵـەکانی تیاچـوو بـوون) وتـی: پـەروەردگارا، بەڕاسـتی مـن ئازارو ناخۆشیم تووش بووە، تۆش لە هەموو کەس میهرەبانتریت.

وە لەوانە پاڕانەوەی زەکەریا پێغەمبەر(عليه الصلاة والسلام) کە فەرمووی: ﴿...رَبِّ لَا تَذَرْنِي فَرْدًا وَأَنتَ خَيْرُ الْوَارِثِينَ﴾.[2]

واتـە: پـەروەردگارا مـن بـە تـەنهایی مەهێڵـەرەوە (نەوەیـەکی چـاك و پـاکم پـێ ببەخشـــە) تـــۆیش چـــاکترین زاتێکـــی لـــە پـــاش مـــن و هـــەموو مردوویـــەك دەمێنیتەوە.

وە پاڕانەوەی ئیبراهیم پێغەمبـەر(عليه الصلاة والسلام): ﴿رَّبَّنَا إِنِّي أَسْكَنتُ مِن ذُرِّيَّتِي بِوَادٍ غَيْرِ ذِي زَرْعٍ عِندَ بَيْتِكَ الْمُحَرَّمِ رَبَّنَا لِيُقِيمُواْ الصَّلاَةَ فَاجْعَلْ أَفْئِدَةً مِّنَ النَّاسِ تَهْوِي إِلَيْهِمْ وَارْزُقْهُم مِّنَ الثَّمَرَاتِ لَعَلَّهُمْ يَشْكُرُونَ﴾.[3]

واتە: پەروەردگارا بەڕاستی من هەندێ لە وەچەو خێزانم لـە دۆڵێکـی وشـکی بـێ کشـتوکاڵدا جێنشـین کـردووە، لـەپاڵ ماڵـە پیرۆزەکەتـدا، لـە پـاڵ (بیـت

---

(١) سورة الأنبياء، الآية: ٨٣.

(٢) سورة الأنبياء، الآية: ٨٩.

(٣) سورة إبراهيم، الآية: ٣٧.

الحـرام)دا، پـەروەردگارا، بۆیــە لێـرە نیشــتەجێم کـردن تـا بەچـاکی نوێــژو خواپەرستی ئەنجام بدەن، جا داواکارم دڵـی هەنـدێك لـەو خەڵکە کەمەنـدکێش بکەیت بۆ لایان و لە ڕزق و ڕۆزی جۆراو جۆر بەهرەمەندیان بکـەیت، بۆئـەوەی سوپاسگوزاری بکەن.

**١٦ . ئەو کەسەی دەپاڕێتەوە سەرەتا بۆ خۆی بپاڕێتـەوەو دەسـت پـێ دەکات ئەگەر ویستی بۆ کەسێکی تر بپاڕێتەوە:**

عـن أُبـيّ بـن كعب(رضـي الله عنـه) أن رسـول الله(ﷺ) كـان إذا ذكـر أحـداً فـدعا لـه بـدأ بنفسه.[١]

واتە: پێغەمبەری خوا(ﷺ) ئەگەر ناوی کەسێکی بهێنایەو بۆی بپاڕایەتەوە سەرەتا بۆ خۆی دەپاڕایەوە.

وە چەسپاویشە کە پێغەمبەری خوا(ﷺ) هەندێ جار سەرەتا بۆ خۆی دەستی پێ نەکردووەو یەکسەر بۆ کەسەکە پاڕاوەتەوە، وەك پاڕانەوەی بـۆ أنس و وابن عباس، وأمِّ إسماعيل(ڕەزای خوایان لێ بێت).[٢]

**١٧ . پێویستە سنوور نەبەزێنێت لە پاڕانەوەکەدا:**

عن ابن سعد بن أبي وقاص(رضي الله عنه) قال: سمعني أبي وأنا أقول: اللهم إني أسألك الجنة ونعيمها، وبهجتها، وكذا وكذا، وأعوذ بك من النار وسلاسلها وأغلالها، وكذا وكذا فقال: يا بني: إني سمعت رسول الله(ﷺ) يقول: "سيكون قوم يعتدون في الدعاء" فإياك أن تكون منهم، إن أُعطيت الجنة أُعطيتها وما فيها، وإن أُعذت من النار أُعذت منها وما فيها من الشر.[٣]

---

(١) أخرجه الترمذي ٥/٤٦٣ وقال: حديث حسن غريب صحيح. وحسنه الشيخ عبد القادر الأرناؤوط في تخريجه لجامع الأصول ٤/١٧٥.

(٢) **بڕوانـە**: شرح النووي على صحيح مسلم ١٥/١٤٤ وفتح الباري ١/٢١٨، وتحفة الأحوذي شرح سنن الترمذي ٩/٣٢٨.

(٣) أبو داود ٢/٧٧ وصحيح الجامع ٣/٢١٨ برقم ٣٥٦٥ وحسنه الألباني في صحيح أبي داود ١/٢٧٧.

واتـه: بـاوکم گـوێی لـێم بـوو کـه مـن دەمـووت: خـوایـه داوای بەهەشـت و نـازو نیعمەت و خۆشیيەکانیو ئەوەو ئەوەت لێ دەکەم تیایدا، وە پەنات پێ دەگرم لـه ئـاگر و زنجـيرو کـۆت و ئـەوەو ئـەوەی...باوکم فـەرموی: کـوڕی خـۆم مـن بیستومە لە پێغەمبەری خوا(ﷺ) کە فەرمویەتی: کەسانێك پەیدا دەبن سنوور دەبەزێنن لە پاڕانەوەدا، جا دەخیل لەوانە نەبیت، چونکە ئەگەر تۆ بەهەشتت پـێ بـدرێت ئـەوا بەهەشـت و هـەموو نیعمەتـەکانیت پـێ دراوە، وە ئەگـەر پـەنا بدرێیت لە ئاگر ئەوا لە ئاگرو هەموو ناخۆشیيەکانی پەنا دراویت.

وعن أبي نعامة أن عبد الله بن مغفل سمع ابنه يقول: اللهم إني أسألك القصر الأبيض عن يمين الجنة إذا دخلتها، فقال: أي بني: سل الله الجنة، وتعوذ به من النار فإني سمعت رسول الله(ﷺ) يقول: "سيكون في هذه الأمة قوم يعتدون في الطهور والدعاء".[1]

واتـه: عبـدالله ی کـوڕی مغفل گـوێی لـه کوڕەکـەی بـوو دەيـووت: خـوایـه داوای کۆشـکێکی سـپیت لێ دەکـەم لـه لای ڕاسـتی بەهەشـتدا ئەگـەر چـوومە نـاوی، فەرمووی: کوڕی خۆم داوای بەهەشت لە خوای گەورە بکەو پەنای پێ بگرە لە ئاگر، چونکە من لە پێغەمبەری خوام(ﷺ) بیستووە دەیفەرموو: کەسانێك لـەم ئوممەتـەدا پەیـدا دەبـن سـنوور دەبـەزێنن لـه کـاتی خۆشـتن و دەسـتنوێژ و پاڕانەوەدا.

١٨ ـ پەشیمان بوونەوەو گەڕاندنەوەی هەقی ئەوانەی کە ستەمت لێ کردوون:

عن أبي هريرة(رضي الله عنه) قال: قال رسول الله(ﷺ): "أيها الناس إن الله طيّب لا يقبل إلا طيّباً، وإن الله أمر المؤمنين بما أمر به المرسلين فقال: ﴿يَآ أَيُّهَا الرُّسُلُ كُلُواْ مِنَ الطَّيِّبَاتِ وَاعْمَلُواْ صَالِحًا إِنِّي بِمَا تَعْمَلُونَ عَلِيمٌ﴾[2]. وقال: ﴿يَآ أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ كُلُواْ مِن

(١) أبو داود ١/٢٤ وصححه الألباني في صحيح أبي داود ١/٢١ وإرواء الغليل ١/١٧١ برقم ١٤٠، وأخرجه أحمد ٤/٨٧.

(٢) سورة المؤمنون، الآية: ٥١.

طَيِّبَاتِ مَا رَزَقْنَاكُمْ﴾[1]. ثم ذكر الرجل يطيل السفر أشعث أغبر، يمد يديه إلى السماء يا رب، يا رب، ومطعمه حرام، ومشربه حرام، وملبسه حرام، وغُذِيَ بالحرام فأنَّى يُستجابُ لذلك".[2]

واتـه: ئـەی خەڵكینـە خـوای گـەورە پـاكو بـێ عەیبـەو پـاكیش نـەبێت وەری ناگرێت، وە فەرمانی كردووە بە ئیمانداران بەو شتەی كە فەرمانی كـردووە بـە پێغەمبەرانیش، وەك فەرمویـەتی: [يَآ أَيُّهَا الرُّسُلُ كُلُواْ مِنَ الطَّيِّبَاتِ وَاعْمَلُواْ صَالِحًا إِنِّي بِمَا تَعْمَلُونَ عَلِيمٌ] (واتە: ئینجا وتمان: ئەی گرۆی پێغەمبەران، بخۆن لە ڕزق و ڕۆزیە چاك و پاكەكان، كارو كردەوەی چاكیش ئەنجام بدەن، بە ڕاستی مـن زانام بە هەموو ئەو كارو كردەوانەی كە دەیكەن). وە فەرمویەتی: [يَآ أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ كُلُواْ مِن طَيِّبَاتِ مَا رَزَقْنَاكُمْ.....]. (واتـە: ئـەی ئەوانـەی باوەڕتـان هێنـاوە، بخۆن لەو ڕزق و ڕۆزیە چاك و باشانەی كە پێمان بەخشیوون..).
پاشـان باسـی پیـاوێكی كـرد لـە سـەفەری دوورو درێژدایـەو قـژ ئاڵۆزكـاوو تـۆزاوی دەستەكانی بەرەو ئاسمان بەرز دەكاتەوەو دەڵێت: پەروەردگارا.... پەروەردگارا.. لـە كاتێكدا خواردنی حەرامی خواردووەو خواردنـەوەی حەرامـەو پۆشـاكی حەرامـەو بـە حەرام گۆشكراوە، ئیتر چۆن وەڵام دەدرێتەوە.

١٩ـ لەگەڵ خۆیدا بۆ دایك و باوكیشی بپاڕێتەوە:
خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَاخْفِضْ لَهُمَا جَنَاحَ الذُّلِّ مِنَ الرَّحْمَةِ وَقُل رَّبِّ ارْحَمْهُمَا كَمَا رَبَّيَانِي صَغِيرًا﴾.[3]

واتە: باڵی میهرەبانی خۆتیان بۆ ڕاخەو ملكەچ بە بۆیان، نزا بكەو بڵـێ: پـەروەردگارا ڕەحمیان پێ بكەو میهرەبان بە بۆیان، هەروەكو چۆن ئەوان ڕەحمیان بە من كـردوو و منیان پەروەردە كردووە بە بچووكی و منداڵی.

---

(١) سورة البقرة، الآية: ١٧٢.
(٢) مسلم ٤/٧٠٣.
(٣) سورة الإسراء، الآية: ٢٤.

وه دەربارەی ئیبراهیم پێغەمبەر(علیه الصلاة والسلام) دەفەرموێت: ﴿رَبَّنَا اغْفِرْ لِي وَلِوَالِدَيَّ وَلِلْمُؤْمِنِينَ يَوْمَ يَقُومُ الْحِسَابُ﴾.[1]

واته: پەروەردگارا، لەخۆم و دایك و باوكم و ئیمانداران خۆش ببە، لەو ڕۆژەدا كە لێپرسینەوە بەرپا دەبێت.

وه دەربارەی نوح پێغەمبەر(علیه الصلاة والسلام) دەفەرموێت: ﴿رَبِّ اغْفِرْ لِي وَلِوَالِدَيَّ وَلِمَن دَخَلَ بَيْتِيَ مُؤْمِنًا وَلِلْمُؤْمِنِينَ وَالْمُؤْمِنَاتِ وَلاَ تَزِدِ الظَّالِمِينَ إِلاَّ تَبَارًا﴾.[2]

واته: پەروەردگارا له خۆم و دایك و باوكم و ئەوانه خۆش ببه كه دێنه ماڵم به ئیمان و باوەڕەوە، هەروەها له ئیماندارانی پیاوو ئیماندارانی ئافرەتیش خۆش ببە، ستەمكارانیش تەنها تیاچوون نەبێت هیچی تر نەكەیتە بەشیان.

**٢٠ . بۆ ئیماندارانی نێرو مێ بپاڕێتەوە لەگەڵ خۆیدا:**

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿...وَاسْتَغْفِرْ لِذَنبِكَ وَلِلْمُؤْمِنِينَ وَالْمُؤْمِنَاتِ...﴾.[3]

واته: داوای لێخۆشبوونی گوناه بۆ خۆت و ئیمانداران لەپیاوان و ئافرەتان هەر لەو بكە.

**٢١ . تەنها له خوای گەورە بپاڕێتەوە:**

عن ابن عباس(رضي الله عنهما) قال: كنت خلف رسول الله(ﷺ) فقال: "يا غلام إني أعلمك كلمات: احفظ الله يحفظك، احفظ الله تجده تجاهك، إذا سألت فاسأل الله، وإذا استعنت فاستعن بالله، واعلم أن الأمة لو اجتمعت على أن ينفعوك بشيء لم ينفعوك إلا بشيء قد كتبه الله لك، وإن اجتمعوا على أن يضروك بشيء لم يضروك إلا بشيء قد كتبه الله عليك، رفعت الأقلام وجفت الصحف".[4]

---

(١) سورة إبراهيم، الآية: ٤١.

(٢) سورة نوح، الآية: ٢٨.

(٣) سورة محمد، الآية: ١٩.

(٤) أخرجه الترمذي ٤/٦٦٧، وقال: حسن صحيح، وأحمد ١/٢٩٣، وصححه الألباني في صحيح الترمذي ٢/٣٠٩.

واتـه: ئـەی منـداڵی پێگەیشـتوو(نۆ بـۆ دە سـاڵ) مـن چـەند ووشـەیەکت فێـر دەکـەم: سـنووری خـوای گـەورە بپـارێزە خـوای گـەورە دەتپارێزێـت، سـنووری خوا بپارێزە لە بەرەو ڕووتـدا دەیبینیـت دێـت بـە هاناتـەوە، ئەگـەر پاڕایتـەوەو داوای پێویستیەکانت کرد تـەنها لـە خـوا داوا بکـە، وە ئەگـەر پشـتت بەسـت تـەنها بـە خـوای ببەسـتە، وە چـاك بزانـە ئەگـەر هـەموو خـەڵکی کۆببنـەوە تـا سـودێکت پـێ بگەیـەنن نـاتوانن هـیچ سـودێکت پـێ بگەیـەنن جگـە لـەوەی کـە خوای گەورە بۆی نوسیویت، وە ئەگـەر کۆببنـەوە لەسـەر ئـەوەی زیانێکـت پـێ بگەیـەنن هـیچ زیانێکـت لێ نـادەن جگـە لـەوەی کـە خـوای گـەورە لەسـەری نوسیویت، قەڵەم هەڵگیراوەو پەڕاویش ووشك بۆتەوە.

## باسی دووەم: کات و شوێن و شێوازەکانی پاڕانەوە:

١ . شەوی قەدر (لَیلة القَدر):

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿إِنَّآ أَنزَلْنَاهُ فِي لَيْلَةِ الْقَدْرِ، وَمَآ أَدْرَاكَ مَا لَيْلَةُ الْقَدْرِ، لَيْلَةُ الْقَدْرِ خَيْرٌ مِّنْ أَلْفِ شَهْرٍ، تَنَزَّلُ الْمَلائِكَةُ وَالرُّوحُ فِيهَا بِإِذْنِ رَبِّهِم مِّن كُلِّ أَمْرٍ، سَلامٌ هِيَ حَتَّى مَطْلَعِ الْفَجْرِ﴾.[١]

واتـه: ئێمـه بەڕاسـتی قورئانمـان دابەزاندۆتـه خـوارەوە لـه شـەوێکی بەفـەڕو ڕێزداردا. جا تۆ چووزانی شەوی بەفەڕ کامەیەو چ خێرو بەرەکەتێکە. شـەوی قەدری بەڕێز لـه هـەزار مـانگ ڕێـزدارو خێردارتـرە (واتـه پاداشـتی عیبـادەت و خواپەرسـتی ئـەو شـەوە بـێ سـنوورە). لـەو شـەوەدا مەلائیکەتـەکان کـە جوبرەئیلیشـیان لەگەڵدایـە دادەبـەزن، لەسـەر ڕووخسـەت و مۆڵـەتی پەروەردگاریان، بەجۆرەها فرمان و کار (بەتایبەت بۆ سەردانی خواپەرستان، بـۆ سـەردانی مزگەوتـەکان، بـۆ گـوێگرتن لـە قورئـان و . . .هتـد). ئـەو شـەوە

---

(١) سورة القدر، الآيات: ١-٥.

**ئاســوودەیی و ئاشــتی و هــێمنی و ڕەحمــەت و میهرەبانیــە، هــەتا کــاتی بەرەبەیان.**

وعن عائشة(رضي الله عنها) قالت: قلت: يا رسول الله! أرأيت إن علمت أي ليلةٍ ليلةَ القدر. ما أقول فيها ؟ قال: "قولي: اللهم إنك عفو كريم تحب العفو فاعف عني".[1]

**واتە: ووتم ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) ئایا ئەگەر زانیم چ شەوێك (ليلة القدر)ە چی بڵێم تیایدا؟ فەرمووی: بڵێ خوایە تۆ لێبوردەو بەخشندەیت، لێبوردنت پێ خۆشە سا لێم خۆشبە.**

**٢ . لە دوای هەموو نوێژە فەرزەکان:**

عن أبي أمامة الباهلي(رضي الله عنه) قال: قيل يا رسول الله! أي الدعاء أسمع ؟ قال: "جوف الليل الآخر، ودبر الصلوات المكتوبات".[2]

**واتــە: وتیــان ئــەی پێغەمبــەری خــوا(ﷺ) کــام پاڕانەوەیــە گیرایــە؟ فــەرمووی: پاڕانەوەی کاتی کۆتایی شەو، وە دوای هەموو نوێژە فەرزەکان.**

**٣ . کۆتا بەشی کۆتایی شەو:**

وعن عمرو بن عبسة(رضي الله عنه) أنه سمع رسول الله(ﷺ) يقول: "أقرب ما يكون الرب من العبد في جوف الليل الآخر، فإن استطعت أن تكون ممن يذكر الله في تلك الساعة فكن".[3]

**واتە: نزیکترین کات کە خوای گەورە لە بەندەوە نزیکە لە کۆتایی شەودایە، جا ئەگەر توانیت لەو کەسانە بیت کە یادی خوا دەکەن لەو کاتەدا ئەوا ببە.**

---

(١) الترمذي ٥/٥٣٤ وصححه، وابن ماجه ٢/١٢٦٥ وأحمد ٦/١٨٢ وصححه الألباني في صحيح الترمذي ٣/١٧٠، وصحيح ابن ماجه ٢/٣٢٨، وانظر: مشكاة المصابيح بتحقق الشيخ الألباني ١/٦٤٨.

(٢) الترمذي ٥/٥٢٦ برقم ٣٤٩٩ وحسنه وله شواهد انظرها في جامع الأصول ٤/١٤٣، وحسنه الألباني في صحيح سنن الترمذي ٣/١٦٨.

(٣) الترمذي ٥/٥٦٩ برقم ٣٥٧٩ وصححه وهو كما قال وأخرجه ابن خزيمة في صحيحه والنسائي والحاكم وصححه. انظر: جامع الأصول ٤/١٤٤ وصححه الألباني في صحيح الترمذي ٣/١٧٣.

وعن أبي هريرة(رضي الله عنه) أن رسول الله(ﷺ) قال: "ينزل ربنا تبارك وتعالى كل ليلة إلى السماء الدنيا، حين يبقى ثلث الليل الآخر فيقول: من يدعوني فأستجيب له، من يسألني فأعطيه، من يستغفرني فأغفر له".[(١)]

واته: خوای پەوەردگارمان هەموو شەوێك دادەبەزێتە ئاسمانی دونیا كاتێ كە سێ بەشی كۆتایی شەو ماوە، وە دەفەرموێت: كێ لێم دەپاڕێتەوە با وەڵامی بدەمەوە. كێ داوام لێ دەكات با پێی ببەخشم. كێ داوای لێخۆشبوونم لێ دەكات تا لێی خۆشبم.

وعن عثمان بن أبي العاص عن النبي(ﷺ) قال: "تفتح أبواب السماء نصف الليل فينادي مناد: هل من داعٍ فيستجاب له، هل من سائل فَيُعطى، هل من مكروب فَيُفَرج عنه، فلا يبقى مسلم يدعو بدعوة إلا استجاب الله تعالى له، إلا زانية تسعى بفرجها، أو عشاراً".[(٢)]

واته: لە ناوەڕاستی شەودا دەرگاكانی ئاسمان دەكرێنەوە، بانگبێژێك بانگ دەكات و دەفەرموێت: كەس هەیە بپاڕێتەوە هەتا وەڵام بدرێتەوە؟ كەس هەیە داوا بكات هەتا پێی ببەخشرێت؟ كەسێكی پێ گیراو هەیە هەتا دەرووی لێ بكرێتەوە؟ جا هیچ موسڵمانێك نامێنێت كە بپاڕێتەوە بە داواكارییەك ئیلا خوای گەورە وەڵامی دەداتەوە. جگە لە ئافرەتێكی زیناكار یان كەسێك كە ماڵ و سامانی خەڵك بە زۆر داگیر دەكات و دەیخوات.

وە خوای گەورە مەدحی ئەو كەسانەی كردووەو كە لە پارشێودا داوای لێخۆشبوونی لێ دەكەن و فەرمویەتی: ﴿كَانُواْ قَلِيلاً مِّنَ اللَّيْلِ مَا يَهْجَعُونَ، وَبِالأَسْحَارِ هُمْ يَسْتَغْفِرُونَ﴾.[(٣)]

---

(١) البخاري ٥٩/٢، برقم ١١٤٥، ومسلم ٥٢١/١، برقم ٧٥٨، وانظر: روايات مسلم ٥٢١/٤-٥٢٣.

(٢) أخرجه الطبراني في المعجم الأوسط، وصحح إسناده الشيخ الألباني في سلسلة الأحاديث الصحيحة ١٢٦/٣ رقم ١٠٧٣، وصحيح الجامع الصغير ٤٧/٣ برقم ٢٩٦٨.

والعشَّار: ئەو كەسەیە كە ماڵ و سامانی خەڵكی بە بەتاڵ دەخوات لە ڕێگای هێزو پلەو پایەوە لێیان دەسەنێت، بە وێنەی باج سەندنەكان كە گومڕگانەیە./ بڕوانە: هەمان سەرچاوەی پێشوو ١٢٦/٣.

(٣) سورة الذاريات، الآيتان: ١٧، ١٨. وانظر: سورة آل عمران، الآية: ١٧.

واتـە: لەشـەوگاردا زۆر کـەم دەخـەوتن و ڕادەکشـان (چـونکە سـەرگەرمی شـەو نوێژ و دەورکردنەوەی قورئان و یادی خوا بوون)، لەبەرەبەیانەکانیشـدا داوای لێخۆشبوونیان لەپەروەردگاریان دەکرد (تا لێیان ببورێت).

٤ . لە نێوان بانگ و قامەتدا:

عن أنس بن مالك(رضي الله عنه) قال: قال رسول الله(ﷺ): "الدعاء لا يرد بين الأذان والإقامة فادعوا".(١)

واتە: پاڕانەوەی نێوان بانگ و قامەت ڕەت نابێتەوە، دەسا بپاڕێنەوە.

٥ . کاتی بانگدان بۆ پێنج نوێژە فەرزەکە:

عن سهل بن سعد قال: قال رسول الله(ﷺ): "ثنتان لا تردان، أو قلما تردان: الدعاء عند النداء، وعند البأس حين يلحم بعضهم بعضاً".(٢)

واتـە: پاڕانــەوەی دوو کـات ڕەت ناکرێتــەوە، یـان زۆر کــەم ڕەت دەبێتــەوە: پاڕانەوەی کاتی بانگ، وە کاتی ناڕەحەتی و تێکڕژانی سوپاکان.

٦ . کاتی قامەتی نوێژ:

وعن سهل(رضي الله عنه) قال: قال رسول الله(ﷺ): "ساعتان لا تُرَدُّ على داع دعوته: حين تقام الصلاة وفي الصف في سبيل الله".(٣)

واتە: دوو کات پاڕانەوەی کەسی دووعاکار ڕەت نابێتەوە: کاتی قامەتی نوێژو کاتی ڕیزی جیهاددا لە پێناوی خوای گەورە.

---

(١) أخرجه الترمذي ٤١٥/١ و٥٧٧/٥، وأبو داود ١٤٤/١، وأحمد ١٥٥/٣ و٢٢٥/٣، وصححه الألباني في صحيح الترمذي ١٨٥/٣، وإرواء الغليل رقم ٢٤٤، ٢٦١/١ وصحيح الجامع ١٥٠/٣.

(٢) أبو داود ٢١/٣، وصححه الألباني في صحيح أبي داود ٤٨٣/٢، وفي رواية له ووقت المطر. والدارمي ٢١٧/١ وقال الحافظ ابن حجر: حديث حسن صحيح، وانظر تخريجه في الدارمي ٢١٧/١ وانظر ما بعده.

(٣) ابن حبان في صحيحه (موارد) وصححه الشيخ ناصر الألباني في صحيح الترغيب والترهيب ١٠٦/١ برقم ٢٥٦، ورقم ٢٦٢.

**٧ ـ کاتی باران بارین و له ژێر باراندا:**

عن سهل بن سعد قال: قال رسول الله(ﷺ): "ثنتان لا تردان أو قلما تردان: الدعاء عند النداء، وعند البأس حين يلحم بعضهم بعضاً". وفي الحديث من طريق موسى عن رزق عن أبي حازم عن سهل ابن سعد به: "ووقت المطر" ولفظ الحاكم: "وتحت المطر".[(١)]

**واته: دوو دوعا ڕەت نابێتەوە، یان کەم جار ڕەت دەبێتەوە: کاتی بانگ، وە کاتی جەنگ و تێکڕژان، له ڕیوایەتەکەی تردا: وە کاتی باران بارین. یان: له ژێر باراندا.**

**٨ ـ له کاتی هێرش بردن و تێکڕژانی ڕیزەکان له پێناوی خوای گەورەدا:**

عن سهل بن سعد(رضي الله عنه) قال: قال رسول الله(ﷺ): "ثنتان لا تردان، أو قلما تردان: الدعاء عند النداء، وعند البأس حين يلحم يعضهم بعضاً".[(٢)]

**واته: دوو پاڕانەوە ڕەت نابێتەوە، یان کەم جار ڕەت دەبێتەوە: کاتی بانگ وە کاتی جەنگ و تێکڕژان.**

**٩ ـ کاتێك له هەموو شەوێکدایه:**

عن جابر(رضي الله عنه) قال: سمعت رسول الله(ﷺ) يقول: "إن في الليل لساعة، لا يوافقها رجل مسلم يسأل الله خيراً من أمر الدنيا والآخرة إلا أعطاه إياه، وذلك كل ليلة".[(٣)]

**واته: له شەودا کاتێك هەیه هیچ پیاوێکی موسڵمان نىیه کە هاوگیری ئەو کاتە بکات و تیایدا بۆ کاری خێری دونیاو قیامەت له خوای گەورە بپاڕێتەوە، ئیلا پێی دەبەخشرێت، ئەمەش له هەموو شەوێکدایه.**

---

(١) أخرجه أبو داود ٣/٢١ وحسنه الشيخ ناصر الألباني في سلسلة الأحاديث الصحيحة برقم ١٤٦٩، ٣/٤٥٣–٤٥٤، وأخرجه الحاكم وصححه ووافقه الذهبي ٢/١١٤.

(٢) أبو داود ٣/٢١ والدارمي ١/٢١٧ وصححه الألباني في صحيح أبي داود ٢/٢٨٣.

(٣) مسلم ١/٥٢١.

**١٠ . كاتێك لە كاتەكانی ڕۆژی جومعە:**

عن أبي هريرة(رضي الله عنه) أن رسول الله(ﷺ) ذكر يوم الجمعة فقال: "فيه ساعة لا يوافقها عبد مسلم، وهو قائم يصلي يسأل الله تعالى شيئاً إلا أعطاه إياه" وأشار بيده يقللها.(١)

**واتە: پێغەمبەری خوا(ﷺ) باسی ڕۆژی جومعەی كردو فەرمووی: كاتێكی تیایە هیچ بەندەیەكی موسڵمان نی‌یە كە هاوگیری بكات و بە پێوە نوێژ بكات و لە خوای گەورە بپاڕێتەوە بۆ هەر شتێك، ئیلا پێی دەبەخشرێت. وە بە پەنجەی دەستی ئاماژەی دەكرد كە كاتەكەی كورت و كەمە.**

وعن أبي هريرة(رضي الله عنه) أن النبي(ﷺ) قال: "إن في الجمعة لساعة لا يوافقها عبد مسلم يسأل الله فيها خيراً إلا أعطاه إياه وهي بعد العصر".(٢)

**واتە: لە ڕۆژی جەمعەدا كاتێكی تیایە هیچ بەندەیەكی موسڵمان نی‌یە كە تیایدا لە خوای گەورە بپاڕێتەوە بۆ هەر خێرێك، ئیلا پێی دەبەخشرێت، ئەویش دوای عەسرە.**

وعن جابر(رضي الله عنه) عن النبي(ﷺ) قال: "يوم الجمعة اثنا عشر ساعة، فيها ساعة لا يوجد مسلم يسأل الله فيها شيئاً إلا أعطاه، فالتمسوها آخر ساعة بعد العصر".(٣)

**واتە: ڕۆژی جومعە دوانزە كاتژمێرە، كاتێكی تیایە هەر موسڵمانێك تیایدا لە خوای گەورە بپاڕێتەوەو داوای شتێك بكات، ئیلا پێی دەبەخشرێت. دە سا لە كۆتا كاتەكانی دوای عەسردا بۆی بگەڕێن.**

---

(١) البخاري ١/٢٥٣، برقم ٩٣٥، ومسلم ٢/٥٨٣، برقم ٨٥٢.

(٢) أحمد ٢/٢٧٢ ويشهد له ما بعده.

(٣) أبو داود ١/٢٧٥ برقم ١٠٤٨ والنسائي ٣/٩٩-١٠٠ في الجمعة باب وقت الجمعة وإسناده جيد وصححه الحاكم ١/٢٧٩ ووافقه الذهبي. وانظر: زاد المعاد بتحقيق الأرناؤوط ٢/٣٩١ والفتح ٢/٣٥١.

وعن أبي بردة بن أبي موسى الأشعري قال: قال عبد الله بن عمر: أسمعت أباك يحدث عن رسول الله(ﷺ) في ساعة الجمعة؟ قال: قلت: نعم سمعته يقول: سمعت رسول الله(ﷺ) يقول: "هي ما بين أن يجلس الإمام إلى أن تُقضى الصلاة".[١]

واتە: عبدالله ی کوڕی عومەر(ڕەزای خوایان لێ بێت) فەرمووی: ئایا لە باوکتەوە هیچ فەرمودەیەکت لە پێغەمبەری خواوە(ﷺ) پێ گەیشتووە دەربارەی کاتەکەی جومعە(کە پاڕانەوەی تێدا گیرایە)؟ دەفەرموێت: منیش ووتم: بەڵێ بیستوومە، فەرموویەتی: ئەو کاتە لە نێوان دانیشتنی ئیمامدایە لەسەر مینبەر، هەتا نوێژەکە دەکات.

ابن القیم(ڕەحمەتی خوای لێ بێت) و غەیری ئەو لە ئەهلی عیلم تەرجیحی ئەوەیان داوە کە ئەو کاتەی ڕۆژی جومعە دوای عەسرە.[٢]

ابن القیم(ڕەحمەتی خوای لێ بێت) فەرموویەتی: "وعندي أن ساعة الصلاة ساعة تُرجى فيها الإجابة أيضاً، فكلاهما ساعة إجابة، وإن كانت الساعة المخصوصة هي آخر ساعة بعد العصر فهي ساعة معينة من اليوم، لا تتقدم ولا تتأخر. وأما ساعة الصلاة فتابعة للصلاة تقدمت أو تأخرت، لأن لاجتماع المسلمين وصلاتهم وتضرعهم وابتهالهم إلى الله تعالى تأثيراً في الإجابة. فساعة اجتماعهم ساعة تُرجى فيها الإجابة وعلى هذا تتفق الأحاديث كلها...".[٣]

واتە: بە لای منەوە کاتی نوێژەکەش کاتێکە ئومێدی گیرا بوونی پاڕانەوەی تیادا دەکرێت، وە هەر دوو کاتەکە کاتی گیرا بوونن، هەر چەند کاتە تایبەتەکە بریتییە لە کۆتا کاتی دوای عەسر، ئەمە کاتێکی دیاری کراوە لەو ڕۆژەداو پێش و پاش ناکەوێت، بەڵام کاتی نوێژەکە پەیوەستە بە نوێژەکەوە

---

(١) مسلم ١/٥٨٤، برقم ٨٥٣.

(٢) بڕوانە: زاد المعاد ٢/٣٨٨-٣٩٧.

(٣) زاد المعاد بتحقيق الأرناؤوط ٢/٣٩٤.

پێشکەوێت یان دوا بکەوێت، چونکە لە کۆبوونەوەی موسڵمانان و نوێژ و لاڵانەوەو پاڕانەوەیاندا بۆ لای خوای گەورە کاریگەری تێدایە بۆ وەڵامدانەوە، جا کاتی کۆبوونەوەیان کاتێکە ئومێدی وەڵامدانەوەی تێدایەو لەسەر ئەمەش سەرجەم فەرمودەکانی ئەم باسە یەکڕان.

١١ ـ کاتی خواردنەوەی ئاوی زمزم لەگەڵ نییەتی پاکدا:

عن جابر(رضي الله عنه) عن النبي(ﷺ) قال: "ماء زمزم لما شُرِبَ له".(١)

واتە: ئاوی زەمزەم بۆ ئەو مەبەستەیە کە بۆی دەخورێتەوە.

١٢ ـ لە کاتی کوڕنوشەکان(السجود)دا:

عن أبي هريرة(رضي الله عنه) قال: قال رسول الله(ﷺ): "أقرب ما يكون العبد من ربه وهو ساجد فأكثروا الدعاء".(٢)

واتە: نزیکترین کاتی بەندە لە پەروەردگارییەوە ئەو کاتەیە کە لە کوڕنوشدایە دە سا زۆر بپاڕێنەوە.

١٣ ـ کاتی بەخەبەر هاتنەوە لە شەوداو پاڕانەوە بە نزای دیاری کراوی ئەو کاتە: عن عبادة بن الصامت(رضي الله عنه)، عن النبي(ﷺ) قال: "من تعارَّ من الليل فقال: لا إله إلا الله وحده لا شريك له، له الملك، وله الحمد، وهو على كل شيء قدير. الحمد لله، وسبحان الله، ولا إله إلا الله، والله أكبر، ولا حول ولا قوة إلا بالله. ثم قال: اللهم اغفر لي – أو دعا – استجيب له. فإن توضأ وصلى قبلت صلاته".(٣)

واتە: هەرکەسێك لە شەودا بەخەبەر هات و وتی: (لا إله إلا الله وحده لا شريك له، له الملك، وله الحمد، وهو على كل شيء قدير. الحمد لله، وسبحان الله، ولا إله إلا

---

(١) ابن ماجه ١٠١٨/٢ وأحمد ٣٥٧/٣ و٣٧٢ وصححه الألباني في إرواء الغليل ٣٢٠/٤ برقم ١١٢٣ وفي الأحاديث الصحيحة برقم ٨٨٣ وفي صحيح الجامع ١١٦/٥ برقم ٥٣٧٨، وفي صحيح ابن ماجه ٣٨٦/٣.

(٢) مسلم ٣٥٠/١.

(٣) البخاري مع الفتح ٣٩/٣ برقم ١١٥٤، والترمذي ٤٨٠/٥.

الله، والله أكبر، ولا حول ولا قوة إلا بالله) پاشـان بڵـێ: خوایـه لـێم خۆشـبه، یـان پاڕایەوە ئەوا وەڵام دەدرێتەوە، خۆ ئەگەر دەستنوێژی شت و نوێژی شت ئەوا نوێژەکەی وەردەگیرێت.

١٤ . لە کاتی پاڕانەوە بە دوعاکەی یونس پێغەمبەر(علیه الصلاة والسلام):

عن سعد قال: قال رسول الله(ﷺ): "دعوة ذي النون إذ دعا بها وهو في بطن الحوت لا إله إلا أنت سبحانك إني كنت من الظالمين، لم يدعُ بها رجل مسلم في شيء قط إلا استجاب الله له".(١)

واتە: پاڕانەوەکـەی (ذي النـون) واتـە یـونس پێغەمبـەر(علیه الصلاة والسلام) کـاتێ پاڕایـەوە لـە سـکی حوتەکـەداو فـەرمووی: (لا إله إلا أنت سبحانك إني كنت من الظالمين) هەرگیز هیچ پیاوێکی موسڵمان نییە کە پێی بپاڕێتەوە بۆ هەرشتێك ئیلا خوای گەورە وەڵامی دەداتەوە.

١٥ . لە کاتی پاڕانەوەی دیاری کراوی کاتی موصیبەتدا:

عن أم سلمة(رضي الله عنها) أنها قالت: سمعت رسول الله(ﷺ) يقول: "ما من مسلم تصيبه مصيبة فيقول ما أمره الله: إنا لله وإنا إليه راجعون، اللهم أجُرْني في مصيبتي، وأَخْلِفْ لي خيراً منها إلا أخلف الله له خيراً منها".(٢)

واتە: هیچ موسڵمانێك نییە کە موسیبەتێکی تووش دەبێـت و هـەروەك خـوای گەورە فەرمانی پێ کردووە بڵێت: (لله وإنا إليه راجعون، اللهم أجُرْني في مصيبتي، وأَخْلِفْ لي خيراً منها) ئیلا خوای گەورە کەسێکی باشتری بۆ دەخاتەوە شوێنی.

---

(١) الترمذي ٥٢٩/٥ برقم ٣٥٠٥ وأحمد ١٧٠/١ والحاكم ٥٠٥/١ وصححه ووافقه الذهبي. قال عبد القادر الأرنؤوط في تخريجه للكلم الطيب ص٨٦: وهو كما قالا: وحسنه ابن حجر وصححه الألباني في صحيح الترمذي ١٦٨/٣.

(٢) مسلم ٦٣٢/٢ و٦٣٣.

**١٦ . له كاتى پاڕانەوى خەڵكى دواى مردنى كەسێك:**

عن أم سلمة(رضي الله عنها) قالت: دخل رسول الله(ﷺ) على أبي سلمة وقد شق بصره فأغمضه، ثم قال: "إن الروح إذا قبض تبعه البصر" فضج ناس من أهله فقال: "لا تدعوا على أنفسكم إلا بخير، فإن الملائكة يؤمنون على ما تقولون". ثم قال: "اللهم اغفر لأبي سلمة، وارفع درجته في المهديين وأخلفه في عقبه في الغابرين، واغفر لنا وله يا رب العالمين، وأفسح له في قبره ونور له فيه".(١)

واتە: لە أم سەلەمەوە(ڕەزای خوای لێ بێت) فەرمویەتی: پێغەمبەری خوا(ﷺ) هات بۆ سەردانی ئەبی سەلەمە كاتێ وەفاتی كرد، ئەبو سەلەمە چاوەكانی ئەبڵەق بوو بوو، ئەویش دای خست و پاشان فەرمووی: كاتێ ڕۆح لە لاشە دەردەچێت چاو شوێنی دەكەوێت. ئیتر كەسانێك لە نزیكانی دەستیان كردە دەنگە دەنگ و گریان، ئەویش فەرمووی: لە خۆتان مەپاڕێنەوە بە چاكە نەبێت چونكە مەلائیكەت ئامین دەكات بۆ ئەو دوعایانەی كە ئێوە دەیلێن، پاشان فەرمووی: "اللهم اغفر لأبي سلمة، وارفع درجته في المهديين وأخلفه في عقبه في الغابرين، واغفر لنا وله يا رب العالمين، وأفسح له في قبره ونور له فيه".

**١٧ . له كاتى پاڕانەوەدا لە دەست پێ كردنی نوێژ بەم دوعایە:**

"الله أكبر كبيراً، والحمد لله كثيراً. وسبحان الله بكرة وأصيلاً" چونكە پیاوێك لە هاوەڵان(ڕەزای خوای لێ بێت) بەمە دەستی پێ كرد، پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرمووی: "عجبت لها فتحت لها أبواب السماء".(٢)

واتە: سەرم سووڕما لێی دەرگاكانی ئاسمانی بۆ كرانەوە.

**١٨ . له كاتى پاڕانەوە لە دەست پێ كردنی نوێژدا بە:** "الحمد لله حمداً كثيراً طيباً مباركاً فيه". چونكە پیاوێك بەمە دەستی پێ كرد. كاتێ پێغەمبەری

---

(١) مسلم ٢/٦٣٤.

(٢) مسلم ٢/٤٢٠.

خوا(ﷺ) نوێژەکەی تەواوکرد فەرمووی: "أيكم المتكلم بالكلمات" واتە: کێ بوو ئەو ووشانەی ووت؟ خەڵکەکە بێ دەنگ بوون. فەرمووی: "أيكم المتكلم فإنه لم يقل بأساً" واتە: ئەوە کێ بوو وای ووت؟ شتی خراپی نەووتووە. پیاوێك فەرمووی: من بووم، کە هاتم بە تەنگە نەفەسیەوە ووتم. پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرمووی: "لقد رأيت اثني عشر ملكاً يبتدرونها أيهم يرفعها". واتە: بینیم دوانزە مەلائیکەت هەڵپەیان بۆ کرد تا کامیان بەرزی بکەنەوە.(١)

١٩ . لە کاتی خوێندنی سورەتی الفاتحە لە نوێژدا بە تەدەببورەوە:

عن أبي هريرة(رضي الله عنه) عن النبي(ﷺ) قال: "من صلى صلاة لم يقرأ فيها بأم القرآن فهي خداج". ثلاثاً "غير تمام" فقيل لأبي هريرة: إنا نكون وراء الإمام. فقال: اقرأ بها في نفسك، فإني سمعت رسول الله(ﷺ) يقول: " قال الله تعالى: قسمت الصلاة بيني وبين عبدي نصفين، ولعبدي ما سأل، فإذا قال العبد: الحمد لله رب العالمين، قال الله تعالى: حمدني عبدي، وإذا قال: الرحمن الرحيم، قال الله تعالى: أثنى علي عبدي. وإذا قال: مالك يوم الدين، قال: مجدني عبدي. (وقال مرة: فوض إلي عبدي) فإذا قال: إياك نعبد وإياك نستعين. قال: هذا بيني وبين عبدي، ولعبدي ما سأل. فإذا قال: اهدنا الصراط المستقيم صراط الذين أنعمت عليهم غير المغضوب عليهم ولا الضالين. قال: هذا لعبدي و لعبدي ما سأل".(٢)

واتە: هەرکەسێك نوێژ بکات و (أم القران) واتە سورەتی (الفاتيحە)ی تێدا نەخوێنێت ئەوا ئەو نوێژەکەی ناتەواوە(وەرناگیرێت)(سێ جار). وە تەواو نیيە، بە ئەبو هورەیرەیان ووت: ئێمە هەندێك جار لە دوای ئیمامەوەین. فەرمووی: هەندێك جار بۆ خۆت بیخوێنە. چونکە من بیستومە پێغەمبەری

(١) مسلم ٢/٤١٩.

(٢) مسلم ١/٢٩٦.

خوا(ﷺ) فەرمویەتی: خوای گەورە دەفەرمویت: من نوێژم لە نێوان خۆم و بەندەکەمدا کردووە بە دوو بەشەوە، وە بۆ بەندەکەشم هەیە چی دەپاڕێتەوە، کاتێ بەندە دەڵێ: (الحمدلله رب العالمين) خوای گەورە دەفەرمویت: بەندەکەم سوپاسی کردم، کاتێ دەڵێت: (الرحمن الرحيم) خوای گەورە دەفەرمویت: بەندەکەم ستایشی کردم، کاتێ دەڵێت: (مالك يوم الدين) دەفەرمویت: بەندەکەم ئەوپەڕی بە گەورەگرتن بە گەورەی گرتم، (جارێکیشیان فەرموی: بەندەکەم کارەکانی سپارد بە من) کاتێ دەڵێت: (إياك نعبد واياك نستعين) دەفەرمویت: ئەمە بەینی من و بەندەکەمەو بۆ بەندەکەشم هەیە چی دەپاڕێتەوە، کاتێ دەڵێت:(اهدنا الصراط المستقيم صراط الذين أنعمت عليهم غير المغضوب عليهم ولا الضالين) دەفەرمویت: ئەمە بۆ بەندەکەمەو بۆ بەندەشم هەیە داوای چی دەکات.

٢٠ . لە کاتی سەربەرز کردنەوە لە چەمینەوەو ووتنی:
"ربنا ولك الحمد حمداً كثيراً طيباً مباركاً فيه"
عن رفاعة قال: كنا نصلي وراء النبي(ﷺ) فلما رفع رأسه من الركعة قال: "سمع الله لمن حمده". قال رجل وراءه: "ربنا ولك الحمد حمداً كثيراً طيباً مباركاً فيه" فلما انصرف قال: "من المتكلم"؟ قال: أنا. قال: "رأيت بضعة وثلاثين ملكاً يبتدرونها أيهم يكتبها أول".[١]
واتە: ئێمە لە پشت پێغەمبەری خواوە(ﷺ) نوێژمان دەکرد، کاتێ سەری بەرز کردەوە لە رکوع فەموی: "سمع الله لمن حمده". پیاوێك لە دوایەوە وتی: "ربنا ولك الحمد، حمداً كثيراً طيباً مباركاً فيه" کاتێ سلاوی دایەوە فەرموی: کێ بوو قسەی کرد؟ فەرموی: من بووم. فەرموی: بینیم سی و ئەوەندە مەلائیکەت هەڵپەیان بۆ کرد تا کامیان یەکەم جار بینوسن.

(١) البخاري ١/١٩٠ ومسلم واللفظ له ١/٣٠٧.

٢١ . لـه كـاتى ووتنــى: (ئـامين) لـه نوێــژدا، ئەگــەر لەگــەڵ ئـامين كردنــى مەلائيكەتەكاندا يەك بگرێت:

عن أبي هريرة(رضي الله عنه) أن رسول الله(ﷺ) قال: "إذا أمَّن الإمامُ فأمِّنوا فإنه من وافق تأمينه تأمين الملائكة، غفر له ما تقدم من ذنبه".[١]

واته: ئەگەر ئيمام (ئامين)ى كرد ئێوەش بڵێت: (ئامين)، چونكه هەركەسێك ووتنى (ئامين)ەكەى لەگەڵ ووتنى مەلائيكەتەكان هاوگير بێت، ئەوا خواى گەورە لە گوناهى لەوەو پێشى خۆش دەبێت.

وعنه(رضي الله عنه) أيضاً أن رسول الله(ﷺ) قال: "إذا قال الإمام: غير المغضوب عليهم ولا الضالين، فقولوا: آمين، فإنه من وافق قوله قول الملائكة غفر له ما تقدم من ذنبه".[٢]

واته: كاتێ ئيمام دەڵێت: (غير المغضوب عليهم ولا الضالين)، ئەوا ئێوە بڵێن: (ئامين)، چونكه هەركەسێك ئامينەكەى لەگەڵ (ئامين)ى مەلائيكەت هاوگير بێت، خواى گەورە لە گوناهى پێشووى خۆش دەبێت.

٢٢ . لە كاتى بەرز بوونەوە لە ركوع و ووتنى: "اللهم ربنا ولك الحمد".

عن أبي هريرة(رضي الله عنه) أن رسول الله(ﷺ) قال: "إذا قال الإمام سمع الله لمن حمده، فقولوا: اللهم ربنا ولك الحمد، فإنه من وافق قوله قول الملائكة غفر له ما تقدم من ذنبه".[٣]

واته: كاتێ ئيمام دەڵێت: (سمع الله لمن حمده)، بڵێن: (اللهم ربنا ولك الحمد)، چونكه هەركەسێك ئەم ووتەيەى لەگەڵ ووتەى مەلائيكەتەكان يەك بگرێت خواى گەورە لە گوناهى لەوەو پێشى خۆش دەبێت.

---

(١) البخاري واللفظ له ١/١٩٠ ومسلم ١/٣٠٧.

(٢) البخاري ١/١٩٣ ومسلم ١/٣٠٦.

(٣) البخاري ١/١٩٣ ومسلم ١/٣٠٦.

٢٣ . دوای صەڵاوات دان لەسەر پێغەمبەری خوا(ﷺ) لە تەحییاتی کۆتایی‌دا:

عن عبد الله بن مسعود(رضي الله عنه) قال: كنت أصلي والنبي(ﷺ) وأبو بكر وعمر معه، فلما جلست بدأت بالثناء على الله، ثم الصلاة على النبي(ﷺ)، ثم دعوت لنفسي فقال النبي(ﷺ): "سلْ تُعطه. سلْ تُعطه".(١)

واتە: من نوێژم دەکرد، پێغەمبەری خواش(ﷺ) ئەبوبەکرو عومەری لەگەڵدا بوو(ڕەزای خوایان لێ بێت)، کاتێ دانیشتم بۆ تەحییات بە ستایشی خوا دەستم پێ کردو پاشان صەڵاواتم دا لەسەر پێغەمبەری خوا(ﷺ)، پاشان بۆ خۆم پاڕامەوە. پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرمووی: داوا بکە دەتدرێتێ (دوو جار).

وعن فضالة(رضي الله عنه) أن النبي(ﷺ) سمع رجلاً يصلي فمجد الله وحمده وصلى على النبي(ﷺ)، فقال النبي(ﷺ): "ادعُ تجب، وسل تُعْطَ".(٢)

واتە: پێغەمبەری خوا(ﷺ) گوێی لە پیاوێك بوو نوێژی دەکردو سوپاس و ستایشی خوای گەورەی دەکردو صەڵاواتی‌دا لەسەر پێغەمبەری خوا(ﷺ)، جا پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرمووی: بپاڕێرەوە وەڵام دەدرێیتەوە. وە داوا بکە دەتدرێتێ.

٢٤ . لە کاتی ووتنی ئەم دوعایەدا پێش سڵاو دانەوەی نوێژ:

"اللهم إني أسألك يا الله الواحد الأحد الصمد الذي لم يلد ولم يولد، ولم يكن له كفواً أحد، أن تغفر لي ذنوبي، إنك أنت الغفور الرحيم"، پێغەمبەری خوا(ﷺ) گوێی لە

(١) أخرجه الترمذي ٤٨٨/٢ وقال حديث حسن صحيح، والنسائي، وأحمد ٢٦/١ و٣٨ وصححه الألباني في صحيح الترمذي برقم ٢٧٦٥، وفي صحيح النسائي برقم ١٢١٧.

(٢) أخرجه النسائي ٤٤/٣ و٤٥ باب فضل التمجيد والصلاة على النبي (ﷺ) والترمذي ٥١٦/٥ قال الشيخ عبد القادر الأرناؤوط: وصححه ابن خزيمة وابن حبان "موارد" برقم ٥١٠ والحاكم ٢٦٨/١ ووافقه الذهبي. انظر: شرح السنة للإمام البغوي بتحقيق الأرناؤوط ١٨٧/٣، وصححه الألباني في صحيح النسائي ٢٧٥/١.

پیاوێك بوو نوێژی دەكردو ئەم دوعایەی دەخوێند فەرموی: "قد غفر له، قد غفر له، قد غفر له" ثلاث مرات.[1] واته: خوا لێی خۆش بوو..(سێ جار)

٢٥ . هەروەها لە كاتی ووتنی:"اللهم إني أسألك بأن لك الحمد، لا إله إلا أنت المنان بديع السماوات والأرض، يا ذا الجلال والإكرام، يا حي يا قيوم". پێغەمبەری خوا(ﷺ) گوێی لە پیاوێك بوو نوێژی دەكرد و بەم دوعایە دەپاڕایەوە، پێی فەرموو: (لقد دعا الله باسمه العظيم الذي إذا دُعي به أجاب، وإذا سُئل به أعطى".[2]

واته: بە دڵنیاییەوە لە خوای گەورە پاڕایەوە بەو ناوە گەورەیەیەی كە ئەگەر پێی بپاڕێیتەوە وەڵام دەدرێیتەوە، وە ئەگەر داوای پێ بكەیت پێت دەدرێت.

٢٦ . هەروەها لە كاتی پاڕانەوەتدا بەم نزایە:

"اللهم إني أسألك بأني أشهد أنك أنت الله، لا إله إلا أنت الأحد الصمد الذي لم يلد ولم يولد، ولم يكن له كفواً أحد". پێغەمبەری خوا(ﷺ) گوێی لە پیاوێك بوو ئەم پاڕانەوەیەی دەكر پێی فەرموو: "لقد سألت الله عز وجل باسمه الأعظم" وفي رواية: "لقد سألت الله بالاسم الذي إذا سُئل به أعطى، وإذا دُعي به أجاب".[3]

واته: لە خوای گەورە پاڕایتەوە بەو ناوە گەورەیەی كە ئەگەر داوای پێ بكرێت پێی دەبەخشرێت و ئەگەر پێی بپاڕێیتەوە وەڵام دەدرێیتەوە.

---

(١) أخرجه أحمد ٣٣٨/٤ وأبو داود والنسائي ٥٢/٣ وصححه الألباني في صحيح النسائي ٢٧٩/١ وقال الشيخ الألباني وأخرجه ابن خزيمة: وصححه الحاكم ووافقه الذهبي. انظر: تخريج صفة صلاة النبي (ﷺ) ص٢٠٣.

(٢) ) أخرجه أبو داود ٨٠/٢ وابن ماجه ١٢٦٨/٢ والترمذي ٥٥٠/٥ وأحمد ١٢٠/٣ والنسائي ٥٢/٣ وصححه ابن حبان برقم ٢٣٨٢ (موارد) والحاكم ٥٠٣/١ ووافقه الذهبي وصححه الألباني في صحيح النسائي ٢٧٩/١.

(٣) أبو داود ٧٩/٢ والترمذي ٥١٥/٥ وأحمد ٣٦٠/٥ وابن ماجه ١٢٦٧/٢ والحاكم ٥٠٤/١ وصححه وأقره الذهبي وصححه الألباني في صحيح الترمذي ١٦٣/٣.

٢٧ . له كاتی پاڕانەوەی موسڵمان بە دوعای دیاری كراوی دوای دەست نوێژ:
عن عمر بن الخطاب(رضي الله عنه) عن النبي(ﷺ) أنه قال: "ما منكم من أحد يتوضأ فيسبغ الوضوء ثم يقول: أشهد أن لا إله إلا الله وحده لا شريك له، وأشهد أن محمداً عبده ورسوله، إلا فُتِحَتْ له أبوابُ الجنة الثمانية يدخل من أيها شاء".[١]

واته: هیچ یەكێك لە ئێوە نىيە كە دەستنوێژێكی تەواو بشۆرێت و پاشان بڵێت: (أشهد أن لا إله إلا الله وحده لا شريك له، وأشهد أن محمداً عبده ورسوله) ئـيلا هـەر هەشت دەرگاكەی بەهەشتی بۆ دەكرێتەوە، هەتا لە كامیانەوە ویستی لێ بێت بچێتە ژوورەوە.

٢٨ . له كاتی پاڕانەوەی ڕۆژی عەرەفە لە كێوی عەرەفە بۆ حاجییان:
عن عمرو بن شعيب، عن أبيه، عن جده أن النبي(ﷺ) قال: "خير الدعاء يوم عرفة، وخير ما قلت أنا والنبيون من قبلي: لا إله إلا الله وحده لا شريك له، له الملك، وله الحمد، وهو على كل شيء قدير".[٢]

واته: چاكترین دوعا دوعاو پاڕانەوەی ڕۆژی عەرەفەیە، وە چاكترینی ئەوەی من و پێغەمبەرانی پێش من ووتومانە: (لا إله إلا الله وحده لا شريك له، له الملك، وله الحمد، وهو على كل شيء قدير).

٢٩ . پاڕانەوەی دوای لادانی خۆر لە ناوەڕاستی ئاسمان پێش نیوەڕۆ:
عن عبد الله بن السائب(رضي الله عنه) أن رسول الله(ﷺ) كان يصلي أربعاً بعد أن تزول الشمس قبل الظهر، وقال: "إنها ساعة تفتح فيها أبواب السماء، وأحب أن يصعد لي فيها عمل صالح".[٣]

---

(١) أخرجه مسلم ٢١٠/١ وأحمد ١٤٦/٤. وانظر: تخريجه بتمامه في إرواء الغليل ١٣٤/١ برقم ٩٦.
(٢) أخرجه الترمذي ومالك في الموطأ ٤٢٢/١. وحسنه الألباني في صحيح الترمذي ١٨٤/٣. وانظر: تخريج مشكاة المصابيح ٧٩٧/٢ برقم ٢٥٩٥ وصحيح الجامع ١٢١/٣ برقم ٣٢٦٩ وسلسلة الأحاديث الصحيحة ٦/٤ رقم ١٥٠٣.
(٣) أخرجه الترمذي ٣٤٢/٢ برقم ٤٧٨ وصححه الألباني في صحيح الترمذي ١٤٧/١ انظر: مشكاة المصابيح للألباني ٢٣٧/١ وأخرجه أيضاً أحمد ٤١١/٣.

واته: پێغەمبەری خوا(ﷺ) دوای لادانی خۆر لە ناوەڕاستی ئاسمان و پێش نیوەڕۆ چوار ڕکات نوێژی دەکرد و دەیفەرموو: ئەمە کاتێکە تیایدا دەرگاکانی ئاسمان دەکرێنەوە، وە منیش پێم خۆشە لەو کاتەدا کردەوەیەکی چاکم بەرز بێتەوە.

وعن أبي أيوب(رضي الله عنه) قال: "إن أبواب السماء تفتح إذا زالت الشمس فلا ترتج حتى يُصَلّى الظهر، فأحب أن يصعد لي إلى السماء خير".(١)

واته: کاتێ خۆر لە ناوەڕاستی ئاسمان لادەدات دەرگاکانی ئاسمان دەکرێنەوە، ئیتر داناخرێت هەتا نوێژی نیوەڕۆ دەکرێت، جا پێم خۆشە چاکەیەکم بەرز بێتەوە بەرەو ئاسمان.

٣٠ ـ لە مانگی ڕەمەزاندا:

عن أبي هريرة(رضي الله عنه) قال: قال رسول الله(ﷺ): "إذا دخل رمضان فتحت أبواب الجنة وغلقت أبواب جهنم وسلسلت الشياطين".(٢)

واته: کاتێ ڕەمەزان هات دەرگاکانی بەهەشت دەکرێنەوەو دەرگاکانی دۆزەخ دادەخرێن و شەیتانەکانیش کۆت دەکرێن.

وعن أبي هريرة(رضي الله عنه) قال: قال رسول الله(ﷺ): "إذا كان رمضانُ فُتحت أبواب الرحمة، وغلقت أبواب جهنم، وسلسلت الشياطين".(٣)

واته: کاتێ ڕەمەزان هات دەرگاکانی ڕەحمەت دەکرێنەوەو دەرگاکانی دۆزەخ دادەخرێن و شەیتانەکانیش کۆت دەکرێن.

٣١ ـ لە کاتی کۆبوونەوەی موسڵمانان لە مەجلیسەکانی زیکر دا:

عن أبي هريرة (رضي الله عنه)، عن النبي (ﷺ) أنه قال: "إن لله ملائكة يطوفون في الطرق يلتمسون أهل الذكر، فإذا وجدوا قوماً يذكرون الله تنادوا: هلموا إلى حاجتكم،

---

(١) أخرجه أحمد مرفوعاً ٥/٤٢٠ وأبو داود وحسنه الألباني في صحيح الجامع ٢/٣٩ برقم ١٥٢٩ وصحيح الترغيب ١/٢٣٨ برقم ٥٨٤، وصحيح سنن أبي داود ١/٢٣٦.

(٢) البخاري مع الفتح ٦/٣٣٦ ومسلم ٢/٧٥٨.

(٣) مسلم ٢/٧٥٨.

قال: فيحفونهم بأجنحتهم إلى السماء الدنيا، قال: فيسألهم ربهم عز وجل – وهو أعلم منهم – ما يقول عبادي؟ قالوا: يقولون يسبحونك، ويكبرونك، ويحمدونك، ويمجدونك..." الحديث وفيه. "فيقول: فأشهدكم أني قد غفرت لهم. قال: يقول ملك من الملائكة فيهم فلان ليس منهم إنما جاء لحاجة قال: هم الجلساء لا يشقى بهم جليسهم".[1]

**واته: خوای گەورە کۆمەڵە مەلائیکەتێکی هەیە بە ڕێگاکاندا دەگەڕێن بە دوای ئەهلی زیکردا، کاتێ کۆمەڵێکیان دۆزییەوە کە خەریکی یادی خوای گەورەن یەکتر بانگ دەکەن و دەفەرموون: وەرن ئەمە مەبەستەکەمانە، دەفەرموێت: جا بە باڵەکانیان تا ئاسمانی دونیا دەوریان دەدەن، دەفەرموێت: خوای پەروەردگار پرسیاریان لێ دەکات لە کاتێکدا ئاگادارترو زاناترە لەوان: بەندەکانم چی‌یان دەوت؟ دەڵێن: تەسبیحات و تەکبیر و حەمدو ستایشی تۆیان دەکرد.....لە کۆتایی فەرمودەکەدا هاتووە: خوای گەورە دەفەرموێت: دە ئێوە بە شاهید دەگرم ئەوە من لێیان خۆش بووم. دەفەرموێت: یەکێك لە مەلائیکەتەکان دەفەرموێت: ئەوان فلانە کەسیان تێدایەو لەوان نی‌یە، بەڵکو بۆ پێویستی‌یەکی خۆی هاتبوو، خوای گەورە دەفەرموێت: ئەوانە کەسانێکن ئەوەی هاونشین و هاوڕێیەتیان بیکات بەدبەخت نابێت.**

وە دەفەرموێت(ﷺ): "لا يقعد قوم يذكرون الله عز وجل إلا حفتهم الملائكة، وغشيتهم الرحمة، ونزلت عليهم السكينة، وذكرهم الله فيمن عنده".[2]

**واتە: هیچ کۆمەڵە کەسێك نین کە لە شوێنێکدا دابنیشن و یادی خوای گەورە بکەن، ئیلا مەلائیکەت دەورەیان دەدەن و ڕەحمەت دایان دەپۆشێت و سەکینەو دڵ ئارامی دادەبەزێتە سەریان، وە خوای گەورە لای مەلائیکەتە پلە بەرزەکان باسیان دەکات.**

(١) البخاري ١٦٨/٧ كتاب الدعوات باب فضل ذكر الله عز وجل، ومسلم ٢٠٦٩/٤ كتاب الذكر والدعاء.

(٢) أخرجه مسلم ٢٠٧٤/٤ في كتاب الذكر والدعاء باب فضل الاجتماع على تلاوة القرآن والذكر من حديث أبي هريرة وأبي سعيد الخدري رضي الله عنهما. رقم ٢٧٠٠.

٣٢ . له كاتی خوێندنی كهڵهشێردا:

"إذا سمعتم صياح الديكة فاسألوا الله من فضله، فإنها رأت ملكاً، وإذا سمعتم نهيق الحمار فتعوذوا بالله من الشيطان، فإنه رأى شيطاناً".[١]

واته: كاتیٚ گوێتان له خوێندنی كهڵهشێر بوو داوای فهزڵی خوای گهوره بكهن چونكه مهلائیكهتی بینیوه. وه كاتیٚ گوێتان له زهڕهی گویٚ درێژ دهبێت پهنا بگرن به خوای گهوره له شهیتان، چونكه شهیتانی بینیوه.

٣٣ . له كاتی ڕووكردنی دڵ بۆ لای خوای گهورهو توند بوون و پهرهسهندنی ئیخلاصدا: وه بهڵگهش لهسهر ئهوه چیرۆك و بهسهرهاتی ئهو كۆمهڵهی دهرگای ئهشكهوتهكهیان لهسهر داخرا.[٢]

٣٤ . پاڕانهوه له ده ڕۆژی سهرهتای مانگی (ذي الحجة) دا:

عن ابن عباس(رضي الله عنهما) عن النبي(ﷺ) أنه قال: "ما من أيام العمل الصالح فيها أحب إلى الله من هذه الأيام" – يعني أيام العشر – قالوا: يا رسول الله! ولا الجهاد في سبيل الله؟ قال: "ولا الجهاد في سبيل الله إلا رجل خرج بنفسه وماله فلم يرجع من ذلك بشيء".[٣]

واته: هیچ ڕۆژانێك نىيه كردهوهی چاك له لای خوای گهوره خۆشهویستتر بێت لهم ڕۆژانه– واته ده ڕۆژی سهرهتای مانگی ذي الحجة– وتیان: ئهی پێغهمبهری خوا(ﷺ) جیهادیش له پێناوی خوادا؟ فهرمووی: وه جیهادیش له پێناوی خوادا، مهگهر پیاوێك به خۆی و ماڵ و سامانیيهوه دهرچێت، هیچیان نهگهڕێنهوه.

---

(١) أخرجه البخاري بلفظه ٤/٨٩، وأخرجه مسلم ٤/٢٠٩٢ من حديث أبي هريرة رضي الله عنه وأبو داود ٤/٣٢٧ والترمذي ٥/٥٠٨ وأحمد ٢/٣٠٧.

(٢) وتقدم تخريج الحديث، وانظر: صحيح البخاري ٤/٣٧، ومسلم ٤/٢٠٩٩.

(٣) البخاري برقم ٩٦٩، وأبو داود واللفظ له برقم ٢٤٣٨، وغيرهما.

## باسی سێیەم: چەند شوێن و جێگایەك پاڕانەوەی تێدا وەلاّم دەدرێتەوە:

١ . لە لای ڕەجمی (الجمرة الصغرى) و(الوسطى) لە ڕۆژانی ( أيام التشريق) دا:

"كان رسول الله(ﷺ) إذا رمى الجمرة التي تلي مسجد منى يرميها بسبع حصيات، يكبر كلما رمى بحصاة، ثم تقدم أمامها فوقف مستقبل القبلة رافعاً يديه يدعو وكان يطيل الوقوف، ثم يأتي الجمرة الثانية فيرميها بسبع حصيات يكبر كلما رمى بحصاة، ثم ينحدر ذات اليسار مما يلي الوادي، فيقف مستقبل القبلة رافعاً يديه يدعو، ثم يأتي الجمرة التي عند العقبة فيرميها بسبع حصيات يكبر عند كل حصاة، ثم ينصرف ولا يقف عندها". [١]

واتە: پێغەمبەری خوا(ρ) هەر کات ئەو زیخەی دەهاوێشت کە دوای مزگەوتی (منى)یە حەوت دانەی دەهاوێشت، لەگەڵ هەر دانەیەکیاندا تەکبیری دەکرد، پاشان دەچووە پێشەوەو دەوەستاو ڕوووەو قیبلە دەپاڕایەوە، دەستەکانی بەرز دەکرەوەو زۆر بە پێوە دەوەستا، پاشان دەچوو بۆ (الجمرة)ی دووەم، حەوت زیخی دەهاوێشت، لەگەڵ هەر دانەیەکیاندا تەکبیری دەکرد، پاشان بە لای چەپدا بە لای دۆڵەکەدا لار دەبوویەوەو دادەگەڕا، ڕوو بە قیبلە دەوەستاو دەستەکانی بەرز دەکردەوەو دەپاڕایەوە، پاشان دەچوو بۆ هاویشتنی زیخ هاویشتنەکەی لای (العَقَبَة)و حەوت زیخەکەی دەهاوێشت و تەکبیری دەکرد لەگەڵ هەموو زیخێکدا، وە ئینجا دەڕۆیشت و لەلایدا نەدەوەستا.

٢ . پاڕانەوە لە ناو کەعبە یان لە ناو(الحِجر) دا:

عن أسامة بن زيد: أن النبي(ﷺ) لما دخل البيت دعا في نواحيه كلها. [٢]

واتە: کاتێ پێغەمبەری خوا(ﷺ) چووە ناو کەعبە لە هەموو گۆشەکانی دا پاڕایەوە.

---

(١) أخرجه البخاري ١٩٤/٢ من حديث عبد الله بن عمر رضي الله عنهما.

(٢) أخرجه مسلم ٩٦٨/٢ برقم ١٣٢٠.

وعن عبد الله بن عمر(رضي الله عنهما) قال: رأيت رسول الله(ﷺ) دخل الكعبة هو وأسامة بن زيد، وبلال، وعثمان بن طلحة فأغلقوا عليهم، فلما فتحوا كنت في أول من ولج، فلقيت بلالاً، فسألته هل صلى فيه رسول الله(ﷺ)؟ قال: نعم صلى بين العمودين اليمانيين". [1]

**واته: پێغەمبەری خوا(ﷺ)م بینی چووە ناو کەعبەو اسامەی کوری زەیدو بیلال و عثمانی کورِی طَلحةی لە گەڵدا بوو(ڕەزای خوایان لێ بێت). دەرگایان لەسەر داخستن، کاتێ دەرگایان کردەوە من یەکەم کەس بووم چوومە ژوورەوە، گەیشتم بە بیلال و پرسیارم لێ کرد: ئایا پێغەمبەری خوا(ﷺ) نوێژی تێدا کرد؟ فەرمووی: بەڵێ لە نێوان هەردوو پایە یەمانیەکەدا نوێژی کرد.**

وعن عائشة(رضي الله عنها) قالت: سألت رسول الله(ﷺ) عن الجدر[2] أمن البيت هو؟ قال: "نعم" قلت: فلِمَ لم يدخلوه في البيت؟ قال: "إن قومك قصرت بهم النفقة". [3]

**واته: پرسیارم لە پێغەمبەری خوا(ﷺ) کرد دەربارەی (الجدر) واتە حیجری کەعبە، کە ئایا ئەویش هەر لە بەیتە؟ فەرموی: بەڵێ، ووتم: ئەی باشە بۆ نەیانخستۆتەوە سەر بەیت؟ فەرموی: گەلەکەت پارەکەیان کەمی هێنا(لە کاتی چاکردنەوەی کەعبە).**

**جا هەر کەس لە ناو حیجردا بپاڕێتەوە وەك ئەوە وایە لە ناو کەعبەدا پاڕابێتەوە، چونکە وەك لە فەرمودەکانی پێشوودا دەرکەوت (حیجر) بەشێکە لە بەیت.**

(١) أخرجه مسلم ٢/٩٦٧ برقم ١٣٢٩ والبخاري مع الفتح ٣/٤٦٣ برقم ١٥٩٨.

(٢) الجدر: واتە حیجری کەعبە.

(٣) أخرجه مسلم ٢/٩٧٣ برقم ١٣٣٣ والبخاري مع الفتح ٣/٤٣٩ برقم ١٥٨٤.

**٣ پاڕانەوە لەسەر (صەفا)و (مەروە) بۆ کەسێك عەمرە یان حەج بکات:**

**جابر(ڕەزای خوای لێ بێت) لە فەرمودە دوورو درێژەکەی باسی حەجی پێغەمبەری خوا(ﷺ)دا دەفەرموێت:** (ثم خرج من الباب إلى الصفا، فلما دنا من الصفا قرأ ﴿إِنَّ الصَّفَا وَالْمَرْوَةَ مِن شَعَآئِرِ اللَّهِ﴾[1] "أبدأ بما بدأ الله به" فبدأ بالصفا فرقى عليه حتى رأى البيت فاستقبل القبلة. فوحَّد الله، وكبَّرهُ، وقال: "لا إله إلا الله وحده لا شريك له، له الملك، وله الحمد، وهو على كل شيء قدير. لا إله إلا الله وحده، أنجز وعده، ونصر عبده، وهزم الأحزاب وحده" ثم دعا بين ذلك قال مثل هذا ثلاث مرات. الحديث. وفيه: "ففعل على المروة كما فعل على الصفا".[2]

**واتە: پاشان لە دەرگاکەوە دەرچوو بەرەو کێوی صەفا، کاتێك نزیك بوویەوە لە صەفا فەرمووی:** ﴿ إنَّ الصَّفا وَالمَروَةِ مِن شَعائِرِاللهِ ﴾ أبدَأُ بِما بَدَأَ اللهُ بِهِ).

**واتە:** ( **صەفاو مەروە لە دروشمەکانی خوای گەورەیە کە دایناوە، بەوەیان دەست پێدەکەم کە خوای گەورە دەستی پێکردووە)، بۆیە بە صەفا دەستی پێکردو سەرکەوت بەسەریدا، هەتا چووە سەرەوەو کەعبەی بینیو ڕووی کردە ڕووگە(قیبلە)و خوای گەورەی بە تاك ڕاگرت و بەگەورەی داناو فەرمووی:** ( لآ إلهَ إلاّ اللهَ وَحدَهُ لا شَريكَ لَه، لَهُ المُلكُ وَلَهُ الحَمْدُ وَهوَ على كلِّ شيءٍ قَدير. لآ إلهَ إلاّ اللهُ وَحدَهُ . أنجَزَ وَعْدَهُ. وَنَصَرَ عَبدَهُ. وَهَزَمَ الأحزابَ وَحْدَهُ ). **پاشان لەم نێوانەدا پاڕایەوە. وە سێجار وەك ئەمەی فەرموو...فەرموودەکە... وە تیایدا هاتووە: کە (چی لەسەر صەفا کرد ئاواشی لەسەر مەروە کرد.....).**

---

(١) سورة البقرة، الآية: ١٥٨.

(٢) مسلم ٨٨٨/٢، برقم ١٢١٨.

**٤ . پاڕانەوە لە لای (المشعر الحرام) ڕۆژی قوربانی کردن بۆ کەسێك کە حەج بکات:**

قال جابر(رضي الله عنه) عن حجة النبي(ﷺ): ثم ركب القصواء حتى أتى المشعر الحرام فاستقبل القبلة، فدعاه وكبَّره، وهلَّله، ووحَّده فلم يزل واقفاً حتى أسفر جداً، فدفع قبل أن تطلع الشمس" الحديث.

**جابر(ڕەزای خوای لێ بێت) دەربارەی حەج کردنەکەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) دەفەرمووێت: (پاشان سواری(القَصْوآء) بوو- کە حوشترەکەی بوو- هەتا گەیشتە(المَشْعَر الحَرام)و ڕووی کردە ڕووگە(قیبلە)و پاڕایەوەو** ( اللهُ أكبر وَلآ إلهَ إلاّ اللهُ وَحدَهُ لا شَريكَ لَه...) **ی کردو بەردەوام ئاوا بە پێوە مایەوە هەتا بە تەواوی دنیا ڕووناك بوویەوەو پێش ئەوەی خۆر هەڵبێ ڕۆیشت و دەرچوو..فەرمودەکە....**

**٥ . پاڕانەوەی حاجی لە کێوی عەرەفە لە ڕۆژی عەرەفەدا:**

عن عمرو بن شعيب، عن أبيه، عن جده أن النبي(ﷺ) قال: "خير الدعاء يوم عرفة، وخير ما قلت أنا والنبيون من قبلي: لا إله إلا الله وحده لا شريك له، له الملك، وله الحمد، وهو على كل شيء قدير".[1]

**واتە: چاکترین پاڕانەوە، پاڕانەوەی ڕۆژی عەرەفەیە. وە چاکترین نزایەك کە من و پێغەمبەرانی پێش من فەرموویانە ئەمەیە:**(( لآ إلهَ إلاّ اللهُ وَحدَهُ لا شَريكَ لَه، لَهُ المُلكُ وَلَهُ الحَمْدُ وَهوَ على كُلِّ شيءٍ قَدير )).

(١) أخرجه الترمذي ومالك في الموطأ ١/٤٢٢. وحسنه الألباني في صحيح الترمذي ٣/١٨٤. وانظر: تخريج مشكاة المصابيح ٢/٧٩٧ برقم ٢٥٩٥ وصحيح الجامع ٣/١٢١ برقم ٣٢٦٩ وسلسلة الأحاديث الصحيحة ٤/٦ رقم ١٥٠٣.

## بەشی پێنجەم: گرنگی دانــی پێغەمبــەران(عليهم الصلاة والسلام) بــە پاڕانــەوەو وەڵامدانەوەی خوای گەورە بۆیان:

پێغەمبـەرانی خـوا(عليهم الصلاة والسلام) و شـوێنکەوتوانیان لـە بەنـدە چاکەکان، گرنگی زۆریان داوە بە پاڕانەوەو خوای گەورەش وەڵامـی داونەتـەوە، وە ئەمـەش زۆر هـاتووە لـە قورئـان و سـوننەتدا، مـن لێـرەدا چـەند نمونەیـەك دێنمـەوە نـەك هەمووی، لەوانە:

١ . آدم پێغەمبەر(عليه الصلاة والسلام): خوای گـەورە دەفـەرموێت: ﴿قَالاَ رَبَّنَا ظَلَمْنَآ أَنفُسَنَا وَإِن لَّمْ تَغْفِرْ لَنَا وَتَرْحَمْنَا لَنَكُونَنَّ مِنَ الْخَاسِرِينَ﴾.(١)

واتە:(ئەوسـا ئـیتر هــەردووکیان هەسـتیان بەهەڵــەی خۆیــان کــردو) وتیــان: پـەروەردگارا ئێمـە ستەممان لـە خۆمـان کـرد، خـۆ ئەگـەر لێمـان خـۆش نـەبیت و بەزەییت پێماندا نەیەتەوە، ئەوە بەڕاستی ئێمە سوێند بـە خـوا لـە خەسارەتمەند و زەرەرمەندانین.

خوای گەورەش لێیان خـۆش بـوو، وەك دەفـەرموێت: ﴿فَتَلَقَّى آدَمُ مِن رَّبِّهِ كَلِمَاتٍ فَتَابَ عَلَيْهِ إِنَّهُ هُوَ التَّوَّابُ الرَّحِيمُ﴾.(٢)

واتە: پاشان ئادەم لەلایەن پەروەردگاریەوە چەند ووشەو نزایەکی وەرگرت (بەدڵ و بەکوڵ پاڕایەوە خوای میهرەبانیش) نزاکەی وەرگرت و لێی خۆش بوو، چونکە بەڕاستی تەنها ئەو، زاتێکی ئێجگار میهرەبان و تۆبە وەرگرە.

پاشـان خـوای گـەورە ڕێـزی لێ گـرت بـە هەڵبـژاردنی، وەك دەفـەرموێت: ﴿إِنَّ اللَّهَ اصْطَفَى آدَمَ وَنُوحًا وَآلَ إِبْرَاهِيمَ وَآلَ عِمْرَانَ عَلَى الْعَالَمِينَ﴾.(٣)

واتـە: بەڕاسـتی خـوا ئـادەم و نـوح و نـەوەکانی ئیـبراهیم و نـەوەکانی عیمرانـی هەڵبژاردووەو ڕێزی داوون بەسەر خەڵکی هەموو جیهاندا.

---

(١) سورة الأعراف، الآية: ٢٣.

(٢) سورة البقرة، الآية: ٣٧.

(٣) سورة آل عمران، الآية: ٣٣.

وه تایبەتی کرد، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ثُمَّ اجْتَبَاهُ رَبُّهُ فَتَابَ عَلَيْهِ وَهَدَى﴾.[1] واتـە: پاشـان پـەروەردگاری هەڵیبـژارد بـۆ پێغەمبـەرێتی و لـەخۆی نزیـك خستەوەو تەوبەشی لێ وەرگرت و شارەزا و ڕێنمایی کرد، بۆ پارانەوەو داوا کردنی لێخۆشبوون.

٢ . نوح پێغەمبەر(عليه الصلاة والسلام): خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَلَقَدْ نَادَانَا نُوحٌ فَلَنِعْمَ الْمُجِيبُونَ، وَنَجَّيْنَاهُ وَأَهْلَهُ مِنَ الْكَرْبِ الْعَظِيمِ﴾.[2]

واتە: بێگومان نوح هاناو هاواری بۆ هێناین، ئێمەیش چاکترین فریاد ڕەسێك بووین کە بەهانا و هاواریەوە چووین. خۆی و کەسوکاری باوەڕداریمان لە تەنگانە گەورەکە ڕزگار کرد...

وه دەفەرموێت: ﴿وَنُوحًا إِذْ نَادَى مِن قَبْلُ فَاسْتَجَبْنَا لَهُ فَنَجَّيْنَاهُ وَأَهْلَهُ مِنَ الْكَرْبِ الْعَظِيمِ، وَنَصَرْنَاهُ مِنَ الْقَوْمِ الَّذِينَ كَذَّبُوا بِآيَاتِنَآ إِنَّهُمْ كَانُواْ قَوْمَ سَوْءٍ فَأَغْرَقْنَاهُمْ أَجْمَعِينَ﴾.[3]

واتە: یادی نوح پێغەمبەریش بکەرەوە کاتێك هاناو هاواری بۆ هێناین لەمەو پێش، جا ئێمەش نزامان گیرا کردو خۆی و خێزانەکەیمان لە تەنگانە گەورەکە ڕزگار کرد. سەرکەوتنیشمان پێبەخشی بەسەر ئەو قەوم و هۆزەی بەڵگە و نیشانەکانی ئێمەیان بە درۆ دەزانی و بڕوایان پێی نەبوو، چونکە بەڕاستی ئەوانیش قەومێکی نالەبارو خراپ بوون، بە گشتی نوقمی ئاوی زریانەکەمان کردن.

وه خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿كَذَّبَتْ قَبْلَهُمْ قَوْمُ نُوحٍ فَكَذَّبُواْ عَبْدَنَا وَقَالُواْ مَجْنُونٌ وَازْدُجِرَ، فَدَعَا رَبَّهُ أَنِّي مَغْلُوبٌ فَانتَصِرْ، فَفَتَحْنَآ أَبْوَابَ السَّمَآءِ بِمَآءٍ مُّنْهَمِرٍ، وَفَجَّرْنَا

---

(١) سورة طه، الآية: ١٢٢.

(٢) سورة الصافات، الآيتان: ٧٥، ٧٦.

(٣) سورة الأنبياء، الآيتان: ٧٦، ٧٧.

الأَرْضَ عُيُونًا فَالْتَقَى الْمَآءُ عَلَى أَمْرٍ قَدْ قُدِرَ، وَحَمَلْنَاهُ عَلَى ذَاتِ أَلْوَاحٍ وَدُسُرٍ، تَجْرِي بِأَعْيُنِنَا جَزَآءً لِّمَن كَانَ كُفِرَ﴾.(١)

واته: پێش ئەمانیش قەومی نوح بروایان بەبەندەی بەڕێزی ئێمە نەکردو وتیان: شێتە، زۆریش پیاهەڵشاخان و دژایەتی کرا، (ئەویش دوای (٩٠) ساڵ هاناو هاواری بۆ پەروەردگاری بردو وتی: خوایە، بەڕاستی من شکستم خواردوەو سەرکەوتنم پێ ببەخشە، ئەوسا ئیتر ئێمە دەروازەکانی ئاسمانمان هاوڕێ لەگەڵ ئاوێکی خوڕدا کردوە، هەموو زەویشمان کرد بەکانیاو و ئاومان لێ هەڵقوڵاند، ئیتر ئاوی ئاسمان و زەوی بەتەقدیرو ویستی خوا بەیەك گەیشتن، بەڕاستی بڕیاری لەسەر درابوو، ئەوسا نوح پێغەمبەرمان لەسەر چەند تەختەو بزمارێك هەڵگرت (مەبەست کەشتیەکەیە). لەژێر چاودێری خۆماندا (لەناو ئەو زریانە سامناکەدا) دەهات و دەچوو، ئا بەو شێوەیە پاداشتی ئەو کەسەمان دایەوە کەبڕوای پێ نەکرا (واتە نوح).

وە خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَقَالَ نُوحٌ رَّبِّ لا تَذَرْ عَلَى الأَرْضِ مِنَ الْكَافِرِينَ دَيَّارًا، إِنَّكَ إِن تَذَرْهُمْ يُضِلُّواْ عِبَادَكَ وَلا يَلِدُواْ إِلاّ فَاجِرًا كَفَّارًا، رَبِّ اغْفِرْ لِي وَلِوَالِدَيَّ وَلِمَن دَخَلَ بَيْتِيَ مُؤْمِنًا وَلِلْمُؤْمِنِينَ وَالْمُؤْمِنَاتِ وَلا تَزِدِ الظَّالِمِينَ إِلاّ تَبَارًا﴾.(٢)

واته: ئینجا نوح وتی: پەروەردگارا هیچ کەسێك لە بێ بڕوایان لەسەر زەویدا مەهێڵەو تۆویان ببڕە. چونکە بەڕاستی ئەگەر تۆ وازیان لێ بهێنیت هەرچی بەندەکانی تۆیە گومڕای دەکەن و کەسیشیان لێنابێت (لە نەوەی تازە) مەگەر خراپەکار و تاوانبار نەبێت. پەروەردگارا لە خۆم و دایك و باوکم و ئەوانە خۆش ببە کە دێنە ماڵم بە ئیمان و باوەڕەوە، هەروەها لە ئیماندارانی پیاوو ئیماندارانی ئافرەتیش خۆش ببە، ستەمکارانیش تەنها تیاچوون نەبێت هیچی تر نەکەیتە بەشیان.

---

(١) سورة القمر، الآيات: ٩-١٤.

(٢) سورة نوح، الآيات: ٢٦-٢٨.

٣ . إبراهيم پێغەمبەر(عليه الصلاة والسلام): خوای گەورە دەربارەی پاڕانەوەکەی دەفەرموێت: ﴿رَبِّ هَبْ لِي حُكْمًا وَأَلْحِقْنِي بِالصَّالِحِينَ، وَاجْعَل لِّي لِسَانَ صِدْقٍ فِي الآخِرِينَ، وَاجْعَلْنِي مِن وَرَثَةِ جَنَّةِ النَّعِيمِ﴾.(١)

واتە: (ئینجا ئیبراهیم نزای کردو وتی) پەروەردگارا زانیاری ودانایی و دەسەڵاتی تەواوم پێ ببەخشە و پەیوەستم بکە بە چاکەکارانەوە. پەروەردگارا یادی خێرم با لەسەر زاری نەوەکانی داهاتوودا بمێنێت. بمگێڕە لە ئەو کەسەناش کە بەهەشتی پڕ لە نازو نیعمەت بەدەست دەهێنن و دەبنە خاوەنی.

خوای گەورە وەڵامی دایەوەو دەربارەی داواکاری یەکەمی فەرموی: ﴿......فَقَدْ آتَيْنَآ آلَ إِبْرَاهِيمَ الْكِتَابَ وَالْحِكْمَةَ وَآتَيْنَاهُم مُّلْكًا عَظِيمًا﴾.(٢)

واتە: خۆ بێگومان ئێمە بەنەوەی ئیبراهیم کتێبمان بەخشیووە (بە موسا تەورات و بە عیسا ئینجیل و بە محمدیش(ﷺ) قورئان) هەروەها لەجۆرەها دانایی بەهرەوەرمان کردوون و (بە هەندێکیان) وەك (یوسف و داود و سولەیمان) دەسەڵات و پاشایەتیەکی گەورەمان بەخشیووە.

وە دەربارەی ئەوەی فەرمووبووی: ﴿وَأَلْحِقْنِي بِالصَّالِحِينَ﴾ خوای گەورە فەرموی:﴿وَإِنَّهُ فِي الآخِرَةِ لَمِنَ الصَّالِحِينَ﴾.(٣)

وە دەربارەی ئەوەی فەرموو بووی: ﴿وَاجْعَل لِّي لِسَانَ صِدْقٍ فِي الآخِرِينَ﴾ فەرموی:﴿وَتَرَكْنَا عَلَيْهِ فِي الآخِرِينَ، سَلامٌ عَلَى نُوحٍ فِي الْعَالَمِينَ، إِنَّا كَذَلِكَ نَجْزِي الْمُحْسِنِينَ، إِنَّهُ مِنْ عِبَادِنَا الْمُؤْمِنِينَ﴾.(٤)

(١) سورة الشعراء، الآيات: ٨٣-٨٥.

(٢) سورة النساء، الآية: ٥٤.

(٣) سورة البقرة، الآية: ٣٠.

(٤) سورة الصافات، الآيات: ١٠٨-١١١.

واتـه: پاشـان ئێمـه لـەناو گـەلان و نـەوەکانی داهـاتوودا نـاوی ئیبراهیمـمـان هێشتەوە. سڵاو و درووود و ڕێز لەسەر ئیبراهیم. ئێمە ئا بەو شێوەیە پاداشتی چاکەکاران دەدەینەوە. بەڕاستی ئەمیش لەبەندە ئیماندارەکانی ئێمەیە.

٤ ـ أیوب پێغەمبەر(علیه الصلاة والسلام): خـوای گـەورە دەفـەرموێت: ﴿وَأَيُّوبَ إِذْ نَادَى رَبَّهُ أَنِّي مَسَّنِيَ الضُّرُّ وَأَنتَ أَرْحَمُ الرَّاحِمِينَ، فَاسْتَجَبْنَا لَهُ فَكَشَفْنَا مَا بِهِ مِن ضُرٍّ وَآتَيْنَاهُ أَهْلَهُ وَمِثْلَهُم مَّعَهُمْ رَحْمَةً مِّنْ عِندِنَا وَذِكْرَى لِلْعَابِدِينَ﴾.[1]

واته: یادی (ئەیوب)یش بکە کاتێك هاناو هـاواری بۆ پـەروەردگاری بـرد (دوای ئـەوەی ماوەیـەکی دوورو درێـژ نـەخۆش کـەوتبوو، جگـە لـەوە پێشـتریش ماڵ و سـامان ومنداڵـەکانی تیاچـوو بـوون) وتـی: پـەروەردگارا، بەڕاسـتی مـن ئـازارو ناخۆشـیم تـووش بـووە، تـۆش لـە هـەموو کـەس میهرەبـانترو لـە هـەموو کـەس بەبەزەیی تریت. جا ئێمە نزامان گیراکردو بەهاواریەوە چووین وهەموو ناخۆشی و نەخۆشـیەکمان لـە کـۆڵ کـردەوە، هـەموو مـاڵ و منـداڵیمان پێبەخشـیوە و ئەوەنـدەی تـریش لەگەڵیانـدا (دەکرێـت خـوای گـەورە هـەر هـەمان مـاڵ و منـداڵی پێشـووی بـۆ زینـدوو کردبێتـەوە، یـاخود نـەوەی نـوێی پێبەخشـیبێت)، ئـەوە ڕەحمەتێکی تایبەتی بوو لە لایەن ئێمەوە، یاداوەریشە بۆ بەنـدە خواپەرستەکان (کە ئەگەر ئەوانیش تووشی بەڵاو ناخۆشی بوون وەك ئەم، لەوەودوا نزایان کرد، خوای میهرەبان بە هاناو هاواری ئەوانیشەوە دەچێت).

٥ . یونس پێغەمبەر(علیه الصلاة والسلام): خـوای گـەورە دەفـەرموێت: ﴿وَذَا النُّونِ إِذ ذَّهَبَ مُغَاضِبًا فَظَنَّ أَن لَّن نَّقْدِرَ عَلَيْهِ فَنَادَى فِي الظُّلُمَاتِ أَن لا إِلَهَ إِلا أَنتَ سُبْحَانَكَ إِنِّي كُنتُ مِنَ الظَّالِمِينَ، فَاسْتَجَبْنَا لَهُ وَنَجَّيْنَاهُ مِنَ الْغَمِّ وَكَذَلِكَ نُنجِي الْمُؤْمِنِينَ﴾.[2]

واتــە: یــادی (ذو النــون)یــش بکــەرەوە (کــە یــونس پێغەمبــەرە) کاتێــك بــە توڕەییـیەوە ڕۆیشـت، گومـانی وابـوو کـە هـەرگیز دنیـای لـێ تـەنگ ناکەینـەوە

---

(١) سورة الأنبیاء، الآیتان: ٨٣، ٨٤.

(٢) سورة الأنبیاء، الآیتان: ٨٧، ٨٨.

(بەڵام بە پێچەوانەی گومانەکەیەوە خوا خستیە ناو سکی نەهەنگەوە)، جا لە ناو تاریکایەکاندا، (تاریکای شەوو دەریا و ناوسکی نەهەنگەکەدا) هاوارو نزای لیَ بەرز بویەوەو وتی: پەروەردگارا هیچ پەرستراوێك نیەیە بە هەق جگە لە تۆ، پاکی و بێگەردی هەر بۆ تۆیە، بەڕاستی من لە ستەمکاران بووم (کاتێك بە بیَ فەرمانی تۆ قەومەکەم بەجێهێشت). ئێمەش بەهانایەوە چووین و ڕزگارمان کرد لەو غەم و پەژارەو تەنگانەیەی کە تێی کەوتبوو، بەو شێوەیەش ئیمانداران ڕزگار دەکەین (کاتێك کە دەکەونە تەنگانەوەو هاناو هاوار بۆ ئێمە دەهێنن).

٦ . زەکەریا پێغەمبەر(علیه الصلاة والسلام): خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿هُنَالِكَ دَعَا زَكَرِيَّا رَبَّهُ قَالَ رَبِّ هَبْ لِي مِن لَّدُنْكَ ذُرِّيَّةً طَيِّبَةً إِنَّكَ سَمِيعُ الدُّعَاءِ، فَنَادَتْهُ الْمَلآئِكَةُ وَهُوَ قَآئِمٌ يُصَلِّي فِي الْمِحْرَابِ أَنَّ اللَّهَ يُبَشِّرُكَ بِيَحْيَى مُصَدِّقًا بِكَلِمَةٍ مِّنَ اللَّهِ وَسَيِّدًا وَحَصُورًا وَنَبِيًّا مِّنَ الصَّالِحِينَ﴾.(١)

واتە: ئا لەو کات و شوێنەدا، زەکەریا هانا و نزای بۆ پەروەردگاری لیَ بەرز بویەوەو وتی: پەروەردگارا نەوەی چاك و پاکم پیَ ببەخشە، بەڕاستی تۆ بیسەری دوعا و نزایت. جا یەکسەر مەلائیکەت جبرئیل بانگی کرد لەکاتێکدا زەکەریا لە میحرابەکەدا وەستا بوو، نوێژی دەکرد، (وتی) بەڕاستی خوای گەورە مژدەت دەداتیَ بە بەخشینی کوڕێك ناوی (یەحیا)یە، بەڕاستدانەری فەرمانی تایبەتی خوایەو گەورەو ڕێزدارەو خۆپارێزە لە گوناهان و پێغەمبەرێکە لە چاکان.

وە دەفەرموێت: ﴿وَزَكَرِيَّا إِذْ نَادَى رَبَّهُ رَبِّ لا تَذَرْنِي فَرْدًا وَأَنتَ خَيْرُ الْوَارِثِينَ، فَاسْتَجَبْنَا لَهُ وَوَهَبْنَا لَهُ يَحْيَى وَأَصْلَحْنَا لَهُ زَوْجَهُ إِنَّهُمْ كَانُواْ يُسَارِعُونَ فِي الْخَيْرَاتِ وَيَدْعُونَنَا رَغَبًا وَرَهَبًا وَكَانُواْ لَنَا خَاشِعِينَ﴾.(٢)

---

(١) سورة آل عمران، الآيتان: ٣٨، ٣٩.

(٢) سورة الأنبياء، الآيتان: ٨٩، ٩٠.

**واتـه: يـادى (زەكـەريا)ش بكـەرەوە كاتێك هانـاو هـاوارى بـۆ پـەروەردگارى بـردو وتـى: پـەروەردگارا مـن بـە تـەنهايى مەهێڵـەرەوە (نەوەيـەكى چـاك و پـاكم پـێ ببەخشــه) تــۆيش چــاكترين زاتێكــى لــه پــاش مــن و هـــەموو مردوويـــەك دەمێنيتــەوە. ئينجـا ئێمــه نزاكــەيمان گــيرا كــردو (يــەحيا)مان پێبەخشــى، هاوسەرەكەشيمان بۆ چاككرد كه مندالّى ببێ، چونكه بەڕاستى ئەوانه چالاك و گورجو گۆڵ بوون له ئەنجامـدانى هـەموو خێـرو چاكەيەكداو نـزاى بـەكوڵيان دەكـرد، بـه ئوميّـدى ڕەحمـەت و بەهەشـتى ئێمـه و لـه دۆزەخ و خـەشمى ئێمـه دەترسان و ئەوانه هەميشه گەردن كەچ بوون بۆ ئێمه.**

**٧ . يـەعقوب پێغەمبـەر**(عليه الصلاة والسلام)**: خـواى گـەورە دەربـارەى بەسـەرهاتى يەعقوب**(عليه الصلاة والسلام) **لەگەڵ كوڕەكانىدا دەفەرموێت:** ﴿وَجَآءُواْ عَلَى قَمِيصِهِ بِدَمٍ كَذِبٍ قَالَ بَلْ سَوَّلَتْ لَكُمْ أَنفُسُكُمْ أَمْرًا فَصَبْرٌ جَمِيلٌ وَاللَّهُ الْمُسْتَعَانُ عَلَى مَا تَصِفُونَ﴾.[1]

**واتـه: براكانيشـى هـاتن بەهەنـدىٚ خـوێنى سـاختەوە كـه بەسـەر كراسـەكەيەوە بوو (هێنايان بۆ باوكيان) ئەويش وتـى: نەخێر وانيه، بەڵكو خۆتـان بـۆ خۆتـان ئـەم كارەتـان سـازداوە، جـا چـارم تـەنها خـۆگريى و ئـارام گرتنـه بـەجوانترين شێوە، هەر خواش داواى كۆمەكى لێدەكرێت لەسەر ئەو باسەى ئێوە دەيكەن.**

**وەخواى گەورە دەربارەيان دەفەرموێت:** ﴿قَالَ هَلْ آمَنُكُمْ عَلَيْهِ إِلاَّ كَمَآ أَمِنتُكُمْ عَلَى أَخِيهِ مِن قَبْلُ فَاللَّهُ خَيْرٌ حَافِظًا وَهُوَ أَرْحَمُ الرَّاحِمِينَ﴾.[2]

**واته: يەعقوبى باوكيان وتـى: (ئەمه داخوازيەكى سەيرە) ئايا هەروا متمانەتان پـێ بكـەم لەسـەرى مەگـەر هـەروەك پێشـتر متمانـەم پێكـردن لەسـەر يوسـفى**

---

(١) سورة يوسف، الآية: ١٨.

(٢) سورة يوسف، الآية: ٦٤.

**برای؟! (سەرئەنجام ڕازیان کردو، ئەویش وتی) کەواتە خوا چاکترین پارێزەرە هەر ئەو میهرەبانترینی میهرەبانانە.**

**وە یەعقوب**(علیه الصلاة والسلام) **فەرموی:** ﴿قَالَ بَلْ سَوَّلَتْ لَكُمْ أَنفُسُكُمْ أَمْرًا فَصَبْرٌ جَمِيلٌ عَسَى اللَّهُ أَن يَأْتِيَنِي بِهِمْ جَمِيعًا إِنَّهُ هُوَ الْعَلِيمُ الْحَكِيمُ، وَتَوَلَّى عَنْهُمْ وَقَالَ يَآ أَسَفَى عَلَى يُوسُفَ وَابْيَضَّتْ عَيْنَاهُ مِنَ الْحُزْنِ فَهُوَ كَظِيمٌ، قَالُواْ تَاللَّهِ تَفْتَؤُاْ تَذْكُرُ يُوسُفَ حَتَّى تَكُونَ حَرَضًا أَوْ تَكُونَ مِنَ الْهَالِكِينَ، قَالَ إِنَّمَآ أَشْكُواْ بَثِّي وَحُزْنِي إِلَى اللَّهِ وَأَعْلَمُ مِنَ اللَّهِ مَا لاَ تَعْلَمُونَ، يَا بَنِيَّ اذْهَبُواْ فَتَحَسَّسُواْ مِن يُوسُفَ وَأَخِيهِ وَلاَ تَاْيْئَسُواْ مِن رَّوْحِ اللَّهِ إِنَّهُ لاَ يَاْيْئَسُ مِن رَّوْحِ اللَّهِ إِلاَّ الْقَوْمُ الْكَافِرُونَ﴾.(١)

**واتە: (کاتێك کوڕەکان گەیشتنەوە لای باوکیان و بەسەرهاتەکەیان بۆ گێڕایەوە) وتی: (وانیە) بەڵکو دیسانەوە خۆتان پیلانێکی ترتان ڕێك خستووە، جا چارم نیە خۆگریەکی جوان نەبێت، ئومێدە پەروەردگار هەموویانم بۆ بهێنێتەوە و بەهەموویان شاد ببم، بەڕاستی ئەو زاتە زاناو دانایە. (ئەوسا چووە کەنارێکەوە) و لێیان دوور کەوتەوەو (بەدەم هەناسەی ساردو ئەسرینەوە) وتی: ئەی داخم بۆ یوسفی نازدار، (لە دڵم دەرناچێت یوسفی جوان خاس و خوا ناسم ئەوەندە گریاو فرمێسکی هەڵوەران)، چاوەکانی سپی هەڵگەڕاو ئاوی سپی تێزاو بینینی نەما لە ئاخ و داخ و خەفەت و ئێشدا، هەر خەم و پەژارەی خۆی دەخواردەوە.**

**(کوڕەکان بەزەییان بە باوکیاندا هاتەوەو) وتیان: سوێند بە خوا تۆ هەر واز ناهێنیت یادی یوسف دەکەیت و ناوی دەبەیت تا وات لێ دێت پەکت دەکەوێت یاخود تیا لە تیاچوون دەبیت.**

---

(١) سورة يوسف، الآيات: ٨٣–٨٧.

(له وەڵامیاندا) وتی: بەڕاستی من باسی سکاڵا و غەم و پەژارەم هەر بۆ لای خوا دەبەم، ئەوەی من دەیزانم لە لایەن خواوە (لە نەخشە و حیکمەتەکانی، لە پێشهات و ڕووداوەکاندا) ئێوە نایزانن.

(دوای چەند ڕۆژێك یەعقوب فەرمانیدا بەکوڕەکانی) و وتی: کوڕەکانم بچنەوە و گوێ هەڵخەن بۆ یوسف و براکەی، لە سۆزو میهرەبانی خوایش نائومێد مەبن، چونکە بەڕاستی کەس نائومێد نابێت لە سۆزو میهرەبانی خوا جگە لە کەسانی خوانەناس و بێ باوەڕ.

پاشان خوای گەورە وەلاّمی پاڕانەوەکەی دایەوەو یوسف(علیه الصلاة والسلام)و براکەی بۆ گێڕایەوە. خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿قَالُواْ أَإِنَّكَ لأَنتَ يُوسُفُ قَالَ أَنَاْ يُوسُفُ وَهَذَآ أَخِي قَدْ مَنَّ اللَّهُ عَلَيْنَآ إِنَّهُ مَن يَتَّقِ وَيِصْبِرْ فَإِنَّ اللَّهَ لاَ يُضِيعُ أَجْرَ الْمُحْسِنِينَ، قَالُواْ تَاللَّهِ لَقَدْ آثَرَكَ اللَّهُ عَلَيْنَا وَإِن كُنَّا لَخَاطِئِينَ، قَالَ لاَ تَثْرَيبَ عَلَيْكُمُ الْيَوْمَ يَغْفِرُ اللَّهُ لَكُمْ وَهُوَ أَرْحَمُ الرَّاحِمِينَ، اذْهَبُواْ بِقَمِيصِي هَذَا فَأَلْقُوهُ عَلَى وَجْهِ أَبِي يَأْتِ بَصِيرًا وَأْتُونِي بِأَهْلِكُمْ أَجْمَعِينَ، وَلَمَّا فَصَلَتِ الْعِيرُ قَالَ أَبُوهُمْ إِنِّي لأَجِدُ رِيحَ يُوسُفَ لَوْلاَ أَن تُفَنِّدُونِ، قَالُواْ تَاللَّهِ إِنَّكَ لَفِي ضَلاَلِكَ الْقَدِيمِ، فَلَمَّآ أَن جَآءَ الْبَشِيرُ أَلْقَاهُ عَلَى وَجْهِهِ فَارْتَدَّ بَصِيرًا قَالَ أَلَمْ أَقُل لَّكُمْ إِنِّي أَعْلَمُ مِنَ اللَّهِ مَا لاَ تَعْلَمُونَ، قَالُواْ يَآ أَبَانَا اسْتَغْفِرْ لَنَا ذُنُوبَنَآ إِنَّا كُنَّا خَاطِئِينَ، قَالَ سَوْفَ أَسْتَغْفِرُ لَكُمْ رَبِّيَ إِنَّهُ هُوَ الْغَفُورُ الرَّحِيمُ﴾.[١]

واتە: (هەموو بەسەرسوڕمانەوە چاویان ئەبڵەق بوو سەرنجیان داو) وتیان: ئایا بەڕاست، بۆچی تۆ یوسفیت؟! وتی: بەڵێ، من یوسفم و ئەمەش (بنیامین)ی برامە، بەڕاستی خوای میهرەبان ڕێزی لێناوین و بەهرەمەندی کردووین، بێگومان ئەوەی خۆپارێز بێت لە گوناهو خۆگر بێت (لە بەرامبەر پێشهاتەکانەوە، خوای گەورە دەرووی لێ دەکاتەوە) ئەوە بەڕاستی خوا پاداشتی چاکەکاران و چاکەخوازان بەزایە نادات.

---

(١) سورة يوسف، الآيات: ٩٠-٩٨.

ئینجا براكانی وتیان: سوێندمان بەخوا بەڕاستی خوای گەورە ڕێزی تۆی داوە بەسەر ئێمەدا، ئێمە بەڕاستی كاتی خۆی بەهەڵەدا چووین و گوناهبارین.
یوسف وتی: خەمتان نەبێت ئەمڕۆ ئیتر هیچ سەر زەنشتێكتان لەسەر نییە، خوا لێتان خۆش بێت، بێگومان ئەو زاتە لە هەموو میهرەبانان میهرەبانترە.
(یوسف هەواڵی باوكی پرسی، كە زانی نابینا بووە وتی): بڕۆن ئەم كراسەم بەرن و بیدەن بەسەرو ڕووی باوكمدا بینایی بۆ دەگەڕێتەوە و چاوی چاك دەبێتەوە، پاشان هەموو كەس و كارتانم بۆ بهێنن بەگشتی.
كاتێك كاروان ئاوەدانی بەجێهێشت و كەوتە ڕێ، باوكیان وتی: بەڕاستی من هەست بە بۆنی یوسف دەكەم ئەگەر بەبێ هۆش و خەڵەفاوم نەزانن و (بڕوام پێبكەن). ئەو كەسانەی كە لە لای بوون وتیان: سوێند بەخوا بێگومان تۆ هەر لە ناو سەرگەردانی و خەیاڵە كۆنەكەی خۆتدایت!!
ئینجا كە مژدە هێنەرەكە گەیشت و كراسەكەیدا بەسەر دەم و چاویدا، خێرا بینایی بۆ گەڕایەوە، چاوەكانی گەشایەوە، وتی: ئایا من پێم نەوتن، بەڕاستی ئەوەی من دەیزانم لە لایەن خواوە، ئێوە نایزانن؟!
(دوای ماوەیەك كوڕەكان گەیشتن و هەموو شتێك ئاشكرا بوو) وتیان: ئەی باوكی بەڕێزمان داوای لێخۆشبوونی گوناهەكانمان بۆ بكە (لە خوای میهرەبان) بەڕاستی ئێمە گوناهكار بووین و بەهەڵەدا چوو بووین.
باوكیان وتی: لە ئایندەدا داوای لێ خۆشبوونتان لە پەروەردگارم بۆ دەكەم، بەڕاستی ئەو زاتە لێخۆشبوو میهرەبانە.
٨ . یوسف پێغەمبەر(علیه الصلاة والسلام): **خوای گەورە دەربارەی بەسەرهاتی ئەو لەگەڵ ئافرەتەكاندا دەفەرموێت:** ﴿قَالَتْ فَذَلِكُنَّ الَّذِي لُمْتُنَّنِي فِيهِ وَلَقَدْ رَاوَدتُّهُ عَن نَّفْسِهِ فَاسَتَعْصَمَ وَلَئِن لَّمْ يَفْعَلْ مَآ ءَامُرُهُ لَيُسْجَنَنَّ وَلَيَكُونًا مِّنَ الصَّاغِرِينَ، قَالَ رَبِّ السِّجْنُ

أَحَبُّ إِلَيَّ مِمَّا يَدْعُونَنِي إِلَيْهِ وَإِلاَّ تَصْرِفْ عَنِّي كَيْدَهُنَّ أَصْبُ إِلَيْهِنَّ وَأَكُن مِّنَ الْجَاهِلِينَ، فَاسْتَجَابَ لَهُ رَبُّهُ فَصَرَفَ عَنْهُ كَيْدَهُنَّ إِنَّهُ هُوَ السَّمِيعُ الْعَلِيمُ﴾.[1]

**واته: ئینجا ژنەکە وتی: ئەوە ئەو کەسەیە کە ئێوە لۆمەو سەرزەنشتی منتان دەکرد لە بارەیەوەو سوێند بەخوا بێگومان من هەوڵمدا لە خشتەی بەرم، کەچی ئەو هەر خۆی گرت و پاك وخاوێنی ویست، سوێند بە خوا ئەگەر ئەوەی من فەرمانی پێدەدەم نەیکات، ئەوە بەڕاستی بەند دەکرێت و زەلیل دەبێت و بەکەم تەماشا دەکرێت.**

**یوسف کەئەمەی بیست وتی: پەروەردگارم من زیندانم لەلا خۆشەویسترە لەوەی کە ئەوان بانگم دەکەن بۆی، خۆ ئەگەر لە فێڵ و تەڵەکەی ئەوانە ڕزگارم نەکەیت و پیلان و نەخشەکانیان دەربازم نەکەیت و لام نەدەیت، لەوانەیە منیش مەیلم بۆ دروست ببێت و ئارەزوویان بکەم پاشان بچمە ڕیزی نەفام و گوناهبارانەوە.**

**جا پەروەردگاری بە هانایەوە چوو نزاکەی گیرا کردو لە تەڵەکە و فێڵی ژنان پاراستی و لایدا، چونکە بەڕاستی هەر ئەو زاتە بیسەری نزاکانەو زانایە (بە دڵ و دەروونەکان).**

**٩ . موسی پێغەمبەر**(علیه الصلاة والسلام)**: خوای گەورە دەربارەی پاڕانەوەکەی دەفەرموێت:** ﴿قَالَ رَبِّ اشْرَحْ لِي صَدْرِي، وَيَسِّرْ لِي أَمْرِي، وَاحْلُلْ عُقْدَةً مِّن لِّسَانِي، يَفْقَهُوا قَوْلِي، وَاجْعَل لِّي وَزِيرًا مِّنْ أَهْلِي، هَارُونَ أَخِي، اشْدُدْ بِهِ أَزْرِي، وَأَشْرِكْهُ فِي أَمْرِي، كَيْ نُسَبِّحَكَ كَثِيرًا، وَنَذْكُرَكَ كَثِيرًا، إِنَّكَ كُنتَ بِنَا بَصِيرًا، قَالَ قَدْ أُوتِيتَ سُؤْلَكَ يَا مُوسَى﴾.[2]

---

(١) سورة يوسف، الآيات: ٣٢-٣٤.

(٢) سورة طه، الآيات: ٢٥-٣٦.

واتـه: (موسـا كەوتـه نـزا كـردن) وتـی: پـەروەردگارا سـینه و دڵ و دەروونم ئاسووده و گوشاد بکه. ئیش و کارو هەوڵ و کۆششم بۆ ئاسان بکه. گرێی زمانم بکەرەوه و زمانم گۆیا و پاراو بکه تا له قسەو گوفتارو مەرامم تێ بگەن. لـه کـەس و کاریشـم هاوکـارو یارمەتیـدەرێکم بـۆ بڕیاربـده. (حـەز دەکـەم) هـاروونی بـرام بێـت، خوایـه پشـتمی پـێ بـەهێز بکـه، بیکـه هاوبـەش و یاریـدەدەرم، لەگەیانـدنی (پەیامەکەتـدا). تـا تەسـبیحات و ستایشـی تـۆ زۆر بکەین، زۆر یادی تۆش بکەین و ناوی تۆ بەرین. چونکه بەڕاستی تـۆ هەمیشـه بینای به حاڵی ئێمه، به هەڵس و کەوتی ئێمه، به هەموو شتێکی ئێمه.

(خـوای گـەورەش) فـەرمووی: ئـەی موسا هـەموو داخوازیـەکانت بـەجێ یـه و پەسەنده و هەموویانت پێدرا.

وەخـوای گـەورە دەربـارەی (موسـا)و (هـارون) پێغەمبـەر(علیهما الصلاة والسلام) دەفەرموێت: ﴿وَقَالَ مُوسَى رَبَّنَآ إِنَّكَ آتَيْتَ فِرْعَوْنَ وَمَلأَهُ زِينَةً وَأَمْوَالاً فِي الْحَيَاةِ الدُّنْيَا رَبَّنَا لِيُضِلُّواْ عَن سَبِيلِكَ رَبَّنَا اطْمِسْ عَلَى أَمْوَالِهِمْ وَاشْدُدْ عَلَى قُلُوبِهِمْ فَلاَ يُؤْمِنُواْ حَتَّى يَرَوُاْ الْعَذَابَ الأَلِيمَ، قَالَ قَدْ أُجِيبَت دَّعْوَتُكُمَا فَاسْتَقِيمَا وَلاَ تَتَّبِعَآنِّ سَبِيلَ الَّذِينَ لاَ يَعْلَمُونَ﴾.(١)

واته: (جا کاتێك ستەمی فیرعەون له سنوور دەرچوو) موسا نزای کردوو وتی: پەروەردگارا، بەڕاستی تۆ له ژیانی دنیادا ناز و نیعمەت و ماڵ و حاڵ و جێگه و ڕێگـەی خـۆش و ڕازاوەت بەخشـیووه بەفیرعـەون و داروودەسـتەکەی، پەروەردگارا، ئەو شتانه بووەته هۆی ئەوەی که (خەڵکی) لـه ڕێبازو بەرنامـەی تـۆ وێـڵ و گـومڕابن، پـەوەردگارا مـاڵ و سـامانیان تـەفرو تونـا بکـەو کـوێری بکـەرەوه، دڵیـان بگوشـه، (تـا هەسـت بەخۆشـی نەکـەن)، ئەمانـه بـاوەڕ نـاهێنن هەتا سزاو ئازاری بەئێش ئەبینن.

---

(١) سورة يونس، الآيتان: ٨٨، ٨٩.

پەوەردگار فەرمووی: بێگومان دوعای هەردووکتان وەرگیرا (وادیارە هاروون (علیه السلام) بەکوڵ ئامینی کردوە)، بەڵام ئێوە هەر بەردەوام بن لەسەر ڕێبازی ڕاست و دروستی هیدایەت و شوێن ڕێبازی ئەوانە مەکەون کە حەق نازانن و نافامن.

وە دەربارەی موسا پێغەمبەر(علیه الصلاة والسلام) دەفەرموێت: ﴿قَالَ رَبِّ إِنِّي ظَلَمْتُ نَفْسِي فَاغْفِرْ لِي فَغَفَرَ لَهُ إِنَّهُ هُوَ الْغَفُورُ الرَّحِيمُ، قَالَ رَبِّ بِمَآ أَنْعَمْتَ عَلَيَّ فَلَنْ أَكُونَ ظَهِيرًا لِّلْمُجْرِمِينَ﴾.(١)

واتە: (ئینجا دەستەکانی بەرز کردەوە و) وتی: پەروەردگارە من بەڕاستی ستەمم لە خۆم کرد کاتێك لە دەستم دەرچوو ئەو کابرایەم کوشت، لێم ببوورە و بمبەخشە، جا خوای میهرەبانیش لێی خۆشبوو، بێگومان ئەو زاتێکی لێخۆشبوو میهرەبانە. (موسا هەستی کرد پەروەردگاری نزای گیرا کردوە بۆیە) وتی: پەروەردگارا مادەم ئاوا نازو نیعمەتی لێخۆش بوونت بە سەردا ڕژاندم، من ئیتر هەرگیز نابمە پشتیوان بۆ تاوانکاران .

١٠ . محمد(ﷺ) و هاوەڵەکانی(ڕەزای خوایان لێ بێت): خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿إِذْ تَسْتَغِيثُونَ رَبَّكُمْ فَاسْتَجَابَ لَكُمْ أَنِّي مُمِدُّكُم بِأَلْفٍ مِّنَ الْمَلآئِكَةِ مُرْدِفِينَ، وَمَا جَعَلَهُ اللَّهُ إِلاَّ بُشْرَى وَلِتَطْمَئِنَّ بِهِ قُلُوبُكُمْ وَمَا النَّصْرُ إِلاَّ مِنْ عِندِ اللَّهِ إِنَّ اللَّهَ عَزِيزٌ حَكِيمٌ﴾.(٢)

واتە: یادی ئەوکاتە بکەنەوە کە لە پەروەردگارتان دەپاڕانەوەو داوای یارمەتیتان لێ دەکرد، خوایش خێرا هات بە هاناتانەوەو فەرمووی بەڕاستی من بەهەزار فریشتەی تر یارمەتیو کۆمەکیتان دەکەم بەشوێن ئەوانی تردا.

(١) سورة القصص، الآيتان: ١٦، ١٧.

(٢) سورة الأنفال، الآيتان: ٩، ١٠.

ئەم یارمەتیەش جگە لە مژدەیەکی خوایی شتێکی تر نەبوو، تا دڵەکانیشتان ئارام بگرێت و دڵنیابن بەو یارمەتیە، ئەگینا سەرکەوتن تەنها لە لایەن خواوە نەبێت نیە، چونکە بەڕاستی هەر خوا خۆی باڵادەست و دانایە.

وە خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَلَقَدْ نَصَرَكُمُ اللَّهُ بِبَدْرٍ وَأَنتُمْ أَذِلَّةٌ فَاتَّقُواْ اللَّهَ لَعَلَّكُمْ تَشْكُرُونَ، إِذْ تَقُولُ لِلْمُؤْمِنِينَ أَلَن يَكْفِيكُمْ أَن يُمِدَّكُمْ رَبُّكُم بِثَلاَثَةِ آلاَفٍ مِّنَ الْمَلآئِكَةِ مُنزَلِينَ، بَلَى إِن تَصْبِرُواْ وَتَتَّقُواْ وَيَأْتُوكُم مِّن فَوْرِهِمْ هَذَا يُمْدِدْكُمْ رَبُّكُم بِخَمْسَةِ آلافٍ مِّنَ الْمَلآئِكَةِ مُسَوِّمِينَ، وَمَا جَعَلَهُ اللَّهُ إِلاَّ بُشْرَى لَكُمْ وَلِتَطْمَئِنَّ قُلُوبُكُم بِهِ وَمَا النَّصْرُ إِلاَّ مِنْ عِندِ اللَّهِ الْعَزِيزِ الْحَكِيمِ﴾.(١)

واتە: بێگومان خوا لە غەزای بەدردا سەرکەوتوی کردن، هەرچەندە ئێوە (لە ژمارە و چەکدا) لاوازو کەم بوون، دەی کەواتە لە خوا بترسن، بۆ ئەوەی سوپاسگوزار بن. (یادیان بهێنە) کاتێك بە ئیماندارانت دەوت: ئایا ئەوەندە بەس نیە کە پەروەردگارتان بە سێ هەزار فریشتە کۆمەکتان بکات و دایانبەزێنێت؟!، بەڵێ ئەگەر خۆڕاگر بن و پارێزکار بن هەر ئێستا دێن بۆ لاتان و پەروەردگارتان پێنج هەزار فریشتەی نیشانەدارتان بۆ ڕەوانە دەکات، بۆ ئەوەی کۆمەکیتان بکەن. جا ئەو (هاوکاری) فریشتانە لەلایەن خواوە تەنها مژدەیەك بوو بۆ ئێوە، تادڵەکانتان پێی دامەزراوتر بێت، ئەگینا سەرکەوتن تەنها لەلایەن خوای باڵادەست و داناوەیەو هەر ئەو دەیبەخشێت.

وە دەفەرموێت: ﴿الَّذِينَ قَالَ لَهُمُ النَّاسُ إِنَّ النَّاسَ قَدْ جَمَعُواْ لَكُمْ فَاخْشَوْهُمْ فَزَادَهُمْ إِيمَاناً وَقَالُواْ حَسْبُنَا اللَّهُ وَنِعْمَ الْوَكِيلُ، فَانقَلَبُواْ بِنِعْمَةٍ مِّنَ اللَّهِ وَفَضْلٍ لَّمْ يَمْسَسْهُمْ سُوءٌ وَاتَّبَعُواْ رِضْوَانَ اللَّهِ وَاللَّهُ ذُو فَضْلٍ عَظِيمٍ﴾.(٢)

---

(١) سورة آل عمران، الآيات: ١٢٣-١٢٦.

(٢) سورة آل عمران، الآيتان: ١٧٣، ١٧٤.

واتە: ئەوانەی کە خەڵکی (باوەڕ لاوان) پێیان دەڵێن: بەڕاستی خەڵکی بێ باوەڕو خوانەناس خۆیان بۆ ئێوە کۆکردۆتەوەو خۆیان بۆ ئێوە مەڵاس داوە، لێیان بترسن (خۆتان تووشی بەڵا مەکەن) بەڵام ئەوان (واتە ئیمانداران بەو پڕوپاگەندەیە) باوەڕیان زیاتر دامەزراو، وتیان: خوامان بەسە کە یاریدەدەرو یارمەتیدەرێکی چاکە. ئەوسا ئیتر موسوڵمانان گەڕانەوە هاوڕێ لەگەڵ فەزڵ و نازو نیعمەتی خوایی‌دا، هیچ ناخۆشیەکیشیان بۆ پێش نەهات، چونکە شوێنی ڕەزامەندی خوا کەوتبوون و (هەر ئەوەشیان مەبەست بوو)، خوای گەورەش هەر خۆی خاوەنی فەزڵ و ڕێزێکی زۆر گەورەیە.

وە ئەو پاڕانەوانەی کە پێغەمبەرمان(ﷺ) پێی پاڕاوەتەوەو وەڵامدانەوەی وەك ڕۆژی ڕووناك لە ناوەندی ئاسماندا بینراوە زۆرە و ناژمێردرێن، بەڵام وەك نمونە لەوانە:

أ . پاڕانەوەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) بۆ ئەنەسی کوڕی مالیك (ڕەزای خوای لێ بێت): کە فەرموی: "اللهم أكثر ماله، وولده، وبارك له فيما أعطيته"[1] [وأطل حياته، واغفر له][2] واتە: خوایە ماڵ و منداڵی زۆر بکەو بەرەکەت بڕژە بەسەر ئەوەی پێت بەخشیوە، وە تەمەنی درێژ بکەو لێی خۆش ببە.

ئەنەس(ڕەزای خوای لێ بێت) فەرمویەتی: ( فوالله إن مالي لكثير، وإن ولدي وولد ولدي ليتعادون نحو المائة اليوم).[3] [وحدثتني ابنتي أمينة أنه دفن لصلبي مقدم الحجاج البصرة بضع وعشرون ومائة][4] وطالت حياتي حتى استحييت من الناس وأرجو المغفرة".[5]

---

(١) البخاري مع الفتح ٤/٢٢٨ و١١/١٤٤، ومسلم ٤/١٩٢٨.

(٢) البخاري في الأدب المفرد برقم ٦٥٣، وصححه الألباني في صحيح الأدب المفرد ص٢١٤.

(٣) مسلم ٤/١٩٢٩.

(٤) البخاري مع الفتح ٤/٢٢٨.

(٥) الأدب المفرد وصححه الألباني في صحيح الأدب المفرد ص٢٤٤.

واته: سوێند به خوا سامانم زۆره، وه کوڕو کوڕەزاشم دهگەنه نزیکەی سەد کەس. وه ئەمینەی کچم بۆی باس کردووم که پێش گەشتی حاجیانی بەصره سەدو بیست و ئەوەنده له نەوەکانم نێژراون، وه ئەمەنده تەمەنم درێژ بوو تا شەرمم دەکرد له خەڵکی، وه ئومێدیشم وایه که خوای گەوره لێم خۆش ببێت.

(وه بێستانێکی هەبوو له ساڵێکدا دوو جار بەروبوومی دەدا، وه ڕیحانەیەکی تێدا بوو بۆنی میسکی لێ دەهات).[(١)]

ب . پاڕانەوەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) بۆ دایکی ئەبو هورەیره(ڕەزای خوای لێ بێت) که خێرا خوای گەوره هیدایەتیداو موسڵمان بوو:

قال أبو هريرة(رضي الله عنه): كنت أدعو أمي إلى الإسلام وهي مشركة، فدعوتها يوماً فأسمعتني في رسول الله(ﷺ) ما أكره، فأتيت رسول الله(ﷺ) وأنا أبكي. قلت: يا رسول الله إني كنت أدعو أمي إلى الإسلام فتأبى عليَّ فدعوتها اليوم فأسمعتني فيك ما أكره، فادعُ الله أن يهدي أمَّ أبي هريرة، فقال رسول الله(ﷺ): "اللهم اهد أمَّ أبي هريرة" فخرجت مستبشراً بدعوة نبي الله(ﷺ) فلما جئت فصرت إلى الباب فإذا هو مجافٌ[(٢)] فسمعت أمي خشف قدميَّ[(٣)] فقالت: مكانك يا أبا هريرة، وسمعتُ خضخضة الماء[(٤)] قال: فاغتسلت ولبست درعها، وعجلت عن خمارها ففتحت الباب ثم قالت: يا أبا هريرة: أشهد أن لا إله إلا الله وأشهد أن محمداً عبده ورسوله. قال: فرجعت إلى رسول الله(ﷺ) وأتيته وأنا أبكي من الفرح، قال قلت: يا رسول الله أبشر قد استجاب الله دعوتك وهدى أمَّ أبي هريرة، فحمد الله وأثنى عليه وقال خيراً، قال: قلت يا رسول الله! ادعُ الله أن يحببني أنا وأمي إلى عباده المؤمنين ويحببهم إلينا. قال: فقال رسول

---

(١) الترمذي ٥/٦٨٣، وانظر: صحيح الترمذي ٣/٢٣٤.

(٢) أي مغلق. واته: داخراو.

(٣) أي صوتهما في الأرض. واته: دەنگی پێیەکانم لەسەر زەوی.

(٤) خضخضة الماء: أي صوت تحريكه. واته: دەنگی خوڕەی ڕۆیشتنی ئاو.

الله(ﷺ): "اللهم حبب عُبيدك هذا وأمَّه إلى عبادك المؤمنين وحبب إليهم المؤمنين" فما خُلِقَ مُؤمِنٌ يسمع بي ولا يراني إلا أحببني.(١)

واته: ئەبو هورەیرە(ڕەزای خوای لێ بێت) دەفەرموێت: من بەردەوام بانگەوازی دایك دەكرد بۆ ئیسلام، ئەویش هاوبەش دانەربوو، ڕۆژێكیان بانگەوازم دەكرد بەڵام ئەو قسەیەكی بە پێغەمبەری خوا(ﷺ) ووت كە زۆر بێ تاقەتی كردم، بۆیە بە گریانەوە هاتمە خزمەت پێغەمبەری خوا(ﷺ) و ووتم: ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) من بانگەوازی دایكم دەكرد بۆ ئیسلام، ئەویش وەڵامی نەدامەوە، بەڵام ئەمڕۆ كاتێ بانگم كرد قسەیەكی بە تۆ ووت كە زۆر ناڕەحەتی كردم، دە سا بپاڕێرەوە كە خوای گەورە هیدایەتی دایكی ئەبو هورەیرە بدات، پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرموی: خوایە هیدایەتی دایكی ئەبو هورەیرە بدە، منیش بە دڵخۆشی پاڕانەوەكەی پێغەمبەری خواوە(ﷺ) هاتمە دەرەوە، تاكو ئەم مژدەیە بگەیەنم پێی، كاتێ گەیشتمە لای دەرگای ماڵەوە بینیم داخراوەو دایكیشم گوێی لە تەقەی پێم بوو فەرموی: ئەی ئەبا هورەیرە نەجوڵێی، وە گوێم لە خوڕەی ئاو بوو، دەفەرموێت: خۆی شت و جلی لەبەر كرد، خێرا سەرپۆشەكەی دا بە سەریداو دەرگاكەی كردەوەو پاشان فەرموی: ئەی ئەبا هورەیرە (أشهد أن لا إله إلا الله وأشهد أن محمداً عبده ورسوله) دەفەرموێت: منیش خێرا گەڕامەوە بۆ لای پێغەمبەری خوا(ﷺ) بە چاوی پڕ لە گریانی خۆشی‌یەوە، دەفەرموێت: ووتم ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) مژدە بێت خوای گەورە پاڕانەوەكەتی وەڵام دایەوەو هیدایەتی دایكی ئەبو هورەیرەی دا، ئەویش سوپاس و ستایشی خوای گەورەی كردو ووتەیەكی خێری فەرموو. دەفەرموێت: ووتم ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ)دە بپاڕێرەوە لە خوای گەورە كە من و دایكم خۆشەویست بكات لە لای بەندە ئیماندارەكانی و ئەوانیش

(١) مسلم ٤/١٩٣٩.

خۆشەویست بکات لە لامان، فەرموی: پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرمووی: خوایە ئەم بەندەیەو دایکی خۆشەویست بکەیت لە دڵی بەندە ئیماندارەکانداو ئیماندارانیش خۆشەویست بکەیت لە دڵی ئەماندا، بۆیە هەر لەبەر ئەمەیە هیچ ئیماندارێك دروست نەکراوە کە ناوی من بهێنێت و نەیبینیبێتم ئیلا خۆشی دەوێم.

ج. پاڕانەوەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) بۆ(عروة ی کوڕی أبي الجعد البارقي): ئەویش پێغەمبەری خوا(ﷺ) دینارێکی دایە تا مەڕێکی پێ بکڕێت، ئەویش دوو مەڕی پێ کڕی و دانەیەکیانی فرۆشتەوە بە دینارێك، جا دینارێك و مەڕێکی هێنایەوە، پێغەمبەری خواش(ﷺ) دوعای بەرەکەتی بۆ کرد لە کڕین و فرۆشتنیدا. بە جۆرێك ئەگەر خۆڵی بکڕییایە قازانجی دەکرد[1]، وە لە مسندی ئیمام ئەحمەددا هاتووە کە پێی فەرموو: "اللهم بارك له في صفقة يمينه" واتە: خوایە بەرەکەت بڕژە بەسەر کڕین و فرۆشتنیدا. بە جۆرێك لە کوفەدا دەوەستا چل هەزاری دەست دەکەوت پێش ئەوەی بگەڕێتەوە بۆ ناو کەسوکاری.[2]

د. پاڕانەوەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) لە هەندێك لە دوژمنەکانی کە گیرا بوونی دوا نەکەوتووە، لەوانەش:

موشریکەکان لە مەککە ئازاری پێغەمبەری خوا(ﷺ)یان دەدا، ئەبو جەهل ڕۆژێك فەرمانی بە هەندێك کەس کرد کە بچن پیسی ناوسکی ئاژەڵێك بێنن و بیخەنە سەر پشتی پێغەمبەری خوا(ﷺ) لە کاتێکدا ئەو لە سەجدەدا بوو، عوقبەی کوڕی ئەبی معیط هەستا بەم کارە، پێغەمبەری خوا(ﷺ) نوێژەکەی تەواو کردو دەنگی هەڵبڕی و ئەم دوعایەی لێ کردن: "اللهم عليك بقريش"

---

(١) البخاري مع الفتح ٦/٦٣٢.

(٢) مسند أحمد ٤/٣٧٦.

سێجار. کاتێ گوێیان لە دەنگی بوو لە قاقای پێکەنین وەستان و لەم پاڕانەوەیەی ترسان، پاشان فەرمووی: اللهم عليك بأبي جهل بن هشام، وعتبة بن ربيعة، وشيبة بن ربيعة، والوليد بن عتبة، وأمية بن خلف، وعقبة بن أبي معيط". ابن مەسعود(ڕەزای خوای لێ بێت) دەفەرمووێت: "فوالذي بعث محمداً(ﷺ) بالحق لقد رأيت الذي سمّى صرعى يوم بدر، ثم سُحِبوا إلى القليب، قليب[1] بدر"[2]. وفي رواية: فأقسم بالله لقد رأيتهم صرعى على بدر قد غيرتهم الشمس وكان يوماً حارّاً".[3]

واتە: سوێند بێت بەو خوایەی محمد(ﷺ)ی بەهەق ڕەوانە کردووە هەموو ئەوانەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) ناوی هێنان بینیمن لە بەدردا کوژراون و پاشان ڕاکێشران بەرەو بیرەکەی بەدر. لە ڕیوایەتەکەی تردا: سوێند دەخۆم بە خوای گەورە هەموویانم بینی لە بەدردا کوژرا بوون و تینی خۆر ڕەنگی شێواندبوون کە ئەو ڕۆژەش زۆر گەرم بوو.

هـ ـ پاڕانەوەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) لە سوراقەی کوڕی مالیك(ڕەزای خوای لێ بێت):

سوراقە شوێن پێغەمبەری خوا(ﷺ) کەوت مەبەستی کوشتنی ئەو و ئەبوبەکر بوو(ڕەزای خوای لێ بێت)، تا ئەو خەڵاتەی بۆ کوشتنیان تەرخان کرابوو بەدەست بهێنێت، چونکە قورەیش دیاریان کردبوو هەر کەسێك پێغەمبەری خوا(ﷺ) و ئەبو بەکر بکوژێت، یان بە دیل بگرێت لە بری هەر یەکێکیان خوێنی کەسێکی پێ دەدرێت (واتە سەد حوشتر)، جا سوراقە شوێن پێغەمبەری خوا(ﷺ) کەوت و پێی گەیشت، کاتێ ئەبو بەکر بینی، فەرمووی: ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) ئەوە سوارێکەو خەریکە دەگات پێمان، پێغەمبەری خوا(ﷺ) ئاوڕی

(١) القليب: واتە: ئەو بیرەی کە بەرز نەکراوەتەوە.

(٢) مسلم ٣/١٤١٨.

(٣) مسلم ٣/١٤٢٠.

بۆ دایەوەو فەرمووی:"اللهم اصرعه" واتە: خوایە بیگلێنیت. ئیتر هەردوو چۆکی ئەسپەکەی سوراقە لە زەوی‌دا چەقی هەتا ئەژنۆکانی.

سوراقە ووتی: واتە: ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) بۆم بپارێرەوە. ئەویش بۆی پاڕایەوەو ئیتر ئەسپەکەی ئازاد بوو، ئەویش گەڕایەوەو هەواڵەکەیانی شاردەوەو باسی نەکرد. جا سەرەتای ڕۆژ کۆششی کرد تا بە پێغەمبەری خوا(ﷺ) بگات، بەلاَم کۆتایی ڕۆژ بووە (مسلحة)[1] سەربازێکی پارێزەرو هەواڵەکەیانی شاردەوە.[2]

**و ـ پاڕانەوەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) لە ڕۆژی بەدردا:**

عن عمر بن الخطاب(رضي الله عنه) قال: لما كان يوم بدر نظر رسول الله(ﷺ) إلى المشركين وهم ألف، وأصحابه ثلاثمائة وتسعة عشر رجلاً، فاستقبل نبي الله(ﷺ) القبلة، ثم مد يديه فجعل يهتف[3] بربه: "اللهم أنجز لي ما وعدتني، اللهم آتِ ما وعدتني، اللهم إن تُهلك هذه العصابة من أهل الإسلام لا تعبد في الأرض" فما زال يهتف بربه مادًّا يديه مستقبل القبلة حتى سقط رداؤه عن منكبيه فأتاه أبو بكر فأخذ رداءه فألقاه على منكبيه ثم التزمه من ورائه وقال: يا نبي الله كذاك[4] مناشدتك ربك فإنه سينجز لك ما وعدك. فأنزل الله عز وجل: ﴿إِذْ تَسْتَغِيثُونَ رَبَّكُمْ فَاسْتَجَابَ لَكُمْ أَنِّي مُمِدُّكُم بِأَلْفٍ مِّنَ الْمَلآئِكَةِ مُرْدِفِينَ﴾[5]. فأمده الله بالملائكة.[6]

---

(١) المسلحة: القوم الذين يحفظون الثغور من العدو، ويرقبون العدو لئلا يطرقهم، فكذلك سراقة كان مدافعاً ومخفياً عن النبي(ﷺ)./ انظر النهاية ٢/٣٨٨، والقاموس المحيط ص٢٨٧.

واتە: ئەو کۆمەڵە کەسەی کەلێنەکان دەپارێزن لە دوژمن، وە چاودێری دوژمن دەکەن نەکو بدات بەسەریاندا، بەو جۆرە سوراقەش بەرگریکارو حەشاردەری هەواڵی پێغەمبەری خوا(ﷺ) بوو.

(٢) البخاري مع الفتح ٧/٢٣٨ و٢٤٠ و٢٤٩، برقم ٣٩٠٦، ٣٩٠٨، ٣٩١١.

(٣) يهتف: يستغيث بالله ويدعوه. واتە: هانا بۆ خوای گەورە دەبات و لێی دەپاڕێتەوە.

(٤) كذاك: أي كفاك، وفي بعض النسخ كفاك، والمعنى صحيح. واتە: بەسە.

(٥) سورة الأنفال، الآية: ٩.

(٦) مسلم ٣/١٣٨٤.

واتـه: لـه ڕۆژی بـەدردا پێغەمبـەری خـوا(ﷺ) تەماشـای موشـریکەکانی کـردو بینی هەزار کەسن، وە هاوەڵەکانیشی(ڕەزای خوایان لێ بێت) سێ سـەدو نـۆ پیـاو بـوون. پێغەمبـەری خـوا(ﷺ) ڕووی کـردە قیبلـەو هـەردوو دەسـتەکانی درێـژ کـردو لـە خـوای خـۆی دەپاڕایـەوەو دەیفـەرموو: خوایـە ئـەو بەڵێنـەی کـە پێـت داوم بۆم بێنـە جـێ، خوایـە ئەگـەر ئـەم کۆمەڵـەی ئـەهلی ئیسلام لـەناو بچـن لـە زەوی‌ـدا تـۆ ناپەرسـترێیت، جـا بـەردەوام لـە خـوای گـەورە دەپاڕایـەوەو دەستەکانیشـی درێـژ کردبـوو ڕوو بـە قیبلـە، هـەتا پۆشـاکەکەی سەرشـانی کـەوت، ئـیتر ئەبوبـەکر(ڕەزای خـوای لێ بێـت) هـات و پۆشـاکەکەی هەڵگرتـەوەو دایـەوە بەسـەر شـانی‌داو لـە دواوە باوەشـی پێـدا کـردوو فـەرمووی: ئـەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) ئیتر بەسە پاڕانەوەت لـە پـەروەردگار، چونکە بێ گومان خـوای گـەورە بەڵێنەکـەی کـە پێـی داویـت دەیهێنێتـە جـێ، خـوای گـەورە ئـەم ئایەتەی دابەزاند: ﴿إِذْ تَسْتَغِيثُونَ رَبَّكُمْ فَاسْتَجَابَ لَكُمْ أَنِّي مُمِدُّكُم بِأَلْفٍ مِّنَ الْمَلآئِكَةِ مُرْدِفِينَ﴾ وە خوای گەورە مەلائیکەتی دابەزاند بۆ کۆمەکی.

قال ابن عباس: بينما رجل من المسلمين يومئذ يشتد في أثر رجل من المشركين أمامه إذ سمع ضربة بالسوط فوقه، وصوت الفارس يقول أقدم حيزوم، فنظر إلى المشرك أمامه فخر مستلقياً. فنظر إليه فإذا هو قد خطم أنفه، وشق وجهه كضربة السوط فاخضرَّ ذلك أجمع، فجاء الأنصاري فحدث بذلك رسول الله(ﷺ) فقال: "صدقت ذلك من مدد السماء الثالثة" فقتلوا يومئذ سبعين وأسروا سبعين.[١]

واتـە: ابـن عبـاس(ڕەزای خـوای لێ بێـت) دەفـەرموێت: لـەو ڕۆژەدا پیاوێـك لـە موسڵمانان شوێن پیاوێکی موشریك کەوتبوو کە لـە پێشی‌یەوە ڕای دەکرد، گوێی لە لێدانی قامچی‌یەك بوو لە سەرەوەو گوێی لـە دەنگی ئەسـپ سوارێك بوو ئەیوت: (أقدم حيزوم) واتە: پێش کەوە حەیزووم...تەماشای موشریکەکەی

---

(١) مسلم ٣/١٣٨٤-١٣٨٥.

کرد له پێشی‌یه‌وه له‌سه‌ر پشت که‌وتووه، بینی لوتی بڕاوه‌و ده‌موچاوی له‌ت بووه به جێی قامچی‌یه‌ك، جا ئه‌نصاری‌یه‌كه هات و ئه‌مه‌ی بۆ پێغه‌مبه‌ری خوا(ﷺ) گێڕایه‌وه، پێغه‌مبه‌ری خوا(ﷺ) فه‌رمووی: ڕاست ده‌كه‌یت ئه‌وه له كۆمه‌كی ئاسمانی سێیه‌مه‌وه بوو، جا له‌و ڕۆژه‌دا حه‌فتایان له موشریكه‌كان كوشت و حه‌فتایان لێ به دیل گرتن.

ز ـ پاڕانه‌وه‌ی پێغه‌مبه‌ری خوا(ﷺ) له ڕۆژی خه‌نده‌ق (الأحزاب)دا:

دوژمنه شه‌ڕكه‌ره‌كانی دژی پێغه‌مبه‌ری خوا(ﷺ) له غه‌زای ئه‌حزابدا پێنج كۆمه‌ڵ بوون: موشریكه‌كانی مه‌ككه، موشریكه‌كانی هۆزه‌كانی عه‌ره‌ب، وه جوله‌كه‌كانی ده‌ره‌وه‌ی مه‌دینه‌و به‌نو قُرَیضه‌و دووڕووه‌كان(المنافقون). وه هه‌موو ئه‌وانه‌ی ئاماده‌ی خه‌نده‌ق بوون له كافران ده هه‌زار كه‌س بوون، موسڵمانه‌كانیش له‌گه‌ڵ پێغه‌مبه‌ری خوا(ﷺ)دا سێ هه‌زار بوون، موشریكه‌كان یه‌ك مانگ ده‌وری پێغه‌مبه‌ری خوایان(ﷺ) گرت به بێ ڕوودانی جه‌نگ له نێوانیاندا، جگه له‌وه‌ی كه له نێوان عه‌مروی كوڕی ودّ العامری له‌گه‌ڵ عه‌لی كوڕی ئه‌بو طالب دا ڕووی‌داو عه‌لی(ڕه‌زای خوای لێ بێت) كوشتی، ئه‌مه‌ش له ساڵی چواری كۆچی‌دا بوو[1]. وه پێغه‌مبه‌وری خوا(ﷺ) دوعای لێ كردن و فه‌رمووی: "اللهم منزل الكتاب، سريع الحساب، اهزم الأحزاب، اللهم اهزمهم وزلزلهم"[2].

واته: خوایه دابه‌زێنه‌ری قورئان. حیسابت خێرایه. حیزب و كۆمه‌ڵه بێ باوه‌ڕه‌كان بشكێنه. خوایه شكستیان پێ بهێنه‌و جێ پێیان له‌ق بكه‌و ڕاچه‌مانیان تێ بخه.

---

(١) بڕوانه: زاد المعاد ٣/٢٦٩-٢٧٦.

(٢) البخاري مع الفتح ٧/٤٠٦ برقم ٤١٥.

خـوای گـەورە سـەربازانێکی خـۆی لـە (بـا) هـەڵکردە سـەر حیزبـەکان و ڕەشماڵـەکانیانی ڕوخانـدو هـیچ مەنجـەڵ و دەفرێکـی نەهێشـت ئـیلا قلّپـی کـردەوەو مێخـی ڕەشماڵـەکانیانی لـە بـن هێنـا، ئـیتر ئۆقرەیـان لێ بـڕا، وە سەربازانێکی لـە مەلائیکـەت دابەزانـدە سـەریان لەرزانـدنی و تـرس و سـامی خستە ناو دڵیـان.[1] خـوای گـەورە دەفـەرموێت: ﴿يَآ أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ اذْكُرُواْ نِعْمَةَ اللَّهِ عَلَيْكُمْ إِذْ جَآءَتْكُمْ جُنُودٌ فَأَرْسَلْنَا عَلَيْهِمْ رِيحًا وَجُنُودًا لَّمْ تَرَوْهَا وَكَانَ اللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ بَصِيرًا، إِذْ جَآءُوكُم مِّن فَـوْقِكُمْ وَمِنْ أَسْفَلَ مِنكُمْ وَإِذْ زَاغَـتِ الأَبْصَـارُ وَبَلَغَـتِ الْقُلُوبُ الْحَنَاجِرَ وَتَظُنُّونَ بِاللَّهِ الظُّنُونَاْ، هُنَالِكَ ابْتُلِيَ الْمُؤْمِنُونَ وَزُلْزِلُواْ زِلْزَالاً شَدِيدًا﴾.[2]

واتـە: ئـەی ئەوانـەی ئیمـان و باوەڕتـان هێنـاوە یـادی نیعمـەتی خـوا بکەنـەوە لەسـەرتان (مەبەسـت جـەنگی خەندەقـە کـە خـوای گـەورە فریـای ئیمانـداران کەوت)، کاتێك سـەربازانی کـوفر هاتنـە سـەرتان ئێمـەش ڕەشـەبایەکی بـەهێزو سەربازانێکمان ناردەسەریان کە نەتاندەبینین، خوای گەورە بینابوو بەهـەوڵ و کۆششـتان (چـۆن پاسـەوانیتان دەکـرد، چـۆن ئـەو چـاڵەقووڵ و درێـژەتان هەڵکەنـد هتـد). کـاتێکیش دوژمنـان لەسـەرو خوارتانـەوە هاتنـە سـەرتان، کاتێکیش چاوەکان ئەبلەق بوون، دڵـەکان گەشـتبوونە گـەروو، گومـانی جـۆراو جۆرتان دەبرد بەبەڵێنەکانی خوای گەورە (بەسـەرکەوتنی ئیمانـداران). لەوێـدا ئیمانـداران تـاقی کرانـەوەو تووشـی تەنگانـەو سـەختیەکی زۆر تونـدو بـەهێز بوون، تووشی دڵەلەرزەیەکی زۆر سەخت کران.

---

(١) زاد المعاد ٣/٢٧٤.

(٢) سورة الأحزاب، الآيات: ٩-١١.

ح ـ پاڕانەوەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) لە ڕۆژی حونەین دا، لە (سەلەمەی کوڕی الأكوع)ەوە لە فەرمودەیەکدا دەربارەی جەنگانی پێغەمبەری خوا(ﷺ) لە غەزای حونەیندا دەفەرموێت: "فلما غشوا رسول الله(ﷺ) نزل عن البغلة ثم قبض من ترابٍ من الأرض ثم استقبل به وجوههم فقال: "شاهت الوجوه"[1] فما خلق الله منهم إنساناً إلا ملأ عينيه تراباً بتلك القبضة، فولوا مدبرين، فهزمهم الله عز وجل، وقسم رسول الله(ﷺ) غنائمهم بين المسلمين".[2]

واتە: کاتێ دەوری پێغەمبەری خوایان(ﷺ) گرت لەسەر هێسترەکەی دابەزی و چنگێك لە خۆڵی لە زەوی‌یەکە هەڵگرت و گرتی‌یە دەموچاویان و فەرموی: ناشیرین بێت ئەو ڕووخسارانە. ئیتر هیچ کەسێکیان نەما ئیلا چاوی پڕ بوو لە خۆڵ بەو مشتە خۆڵە. جا پشتیان هەڵکردو خوای گەورە شکاندنی، وە پێغەمبەری خوا(ﷺ) غەنیمەتەکانیانی بەسەر موسڵماناندا دابەش کرد.

---

(١) شاهت الوجوه: واتە: ناشیرین و قێزەون بن.

(٢) مسلم ٣/١٤٠٢.

## بەشی شەشەم: چەند پاڕانەوەیەکی گیرا بوو

هەرکەسێك کار بە مەرجەکانی پاڕانەوە بکات و دووربکەوێتەوە لە ڕێگرەکانیو ئادابەکانی ئەنجام بدات و بە دوای کات و شوێنی گیرابوونیدا بگەڕێت ئەوە لەو کەسانە دەبێت کە خوای گەورە وەڵامی پاڕانەوەی دەداتەوە، وە لە فەرمودەدا چەند جۆرێك لەو پاڕانەوانە ڕوون کراوەتەوە کە مەرجەکانیان تێدا ئەنجام دراوەو خوای گەورەش وەڵامی داونەتەوە لەوانە:

١ - پاڕانەوەی موسڵمان بۆ برای موسڵمانی بە نهێنیو پاشەملە:

عن أم الدرداء(رضي الله عنها) أنها قالت لصفوان: أتريد الحج العام ؟ قال: فقلت: نعم، قالت: فادعُ الله لنا بخير فإن النبي(ﷺ) كان يقول: "دعوةُ المرء المسلم لأخيه بظهر الغيب مستجابة، عند رأسه ملك كلما دعا لأخيه بخير قال الملك الموكل به: آمين ولك بمثل".[١]

واتە: ئوم الدرداء(ڕەزای خوای لێ بێت) بە صەفوانی فەرموو: ئەمساڵ بە تەمای حەج کردنیت؟ دەفەرموێ: ووتم: بەڵێ. فەرموی: دە دوعای خێرمان بۆ بکە، چونکە پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرمویەتی: هیچ بەندەیەکی موسڵمان نییە کە لە پاشەملە بۆ براکەی دەپاڕێتەوە ئیلا مەلائیکەت دەفەرموێت بۆ تۆش بە هاووێنەی ئەو.

وعن أبي الدرداء(رضي الله عنه) عن النبي(ﷺ) أنه قال: "ما من عبد مسلم يدعو لأخيه بظهر الغيب إلا قال المَلَكُ ولكَ بِمِثلٍ".[٢]

واتە: هیچ بەندەیەکی موسڵمان نییە کە لە پاشەملە بۆ براکەی دەپاڕێتەوە ئیلا مەلائیکەت دەفەرموێت بۆ تۆش بە هاووێنەی ئەو.

٢ - پاڕانەوەی ستەم لێ کراو(المظلوم):

---

(١) مسلم ٤/٢٠٩٤ برقم ٢٧٣٣.

(٢) مسلم ٤/٢٠٩٤.

عن ابن عباس(رضي الله عنهما): أن النبي(ﷺ) بعث معاذاً إلى اليمن وساق الحديث وقال فيه: "واتقِ دعوة المظلوم فإنها ليس بينها وبين الله حجاب".[٣]

**واتـه: پێغەمبـەری خـوا(ﷺ) مـەعـاذی نـارد بـۆ یەمـەن ......فـەرموی: وە خـۆت بپارێزە لە پاڕانەوەی ستەم لێ کراو چونکە لە نێوان پاڕانەوەکەو خوای گەورەدا بەربەست نیيە.**

**وە لـەو پاڕانـەوە وەڵام دراوانـە بەسـەرهاتەکەی سـەعد(ڕەزای خـوای لێ بێـت) لەگـەڵ ئەبی سەعدە کاتێ پرسیاریان لێ کرد دەربارەی سەعد ووتی:**

"أما إذ نشدتنا فإن سعداً كان لا يسير بالسرية، ولا يقسم بالسوية، ولا يعدل في القضية، قال سعد: أما والله لأدعون بثلاث: اللهم إن كان عبدك هذا كاذباً قام رياء وسمعة فأطل عمره، وأطل فقره، وعرضه بالفتن، وكان بعد إذا سئل يقول: شيخ كبير مفتون أصابتني دعوة سعد، قال عبد الملك: فأنا رأيته بعد قد سقط حاجباه على عينيه من الكِبَر، وإنه ليتعرض للجواري في الطريق يغمزُهُن".[١]

**واتە: سەعد سريە نانێرێت، وە بە یەکسانی شت دابەش ناکات، وە دادپەروەر نیيە لە قەزاوەتیدا. جا سەعد فەرموی: دەسا منیش سوێند بە خـوای گـەورە سێ دوعا دەکەم و دەڵێم: خوایە ئەگەر ئەم بەندەیەت درۆ دەکات و لەبەر ڕیاو سـومعە هەسـتاو ئـەم قسـەیەی کـرد ئـەوا خوایـە تەمـەنی درێـژ بکـەیت و زۆر هـەژاری بکـەیت و تووشـی فیتنـەی بکـەیت. جـا لـە کۆتـایی تەمەنیـدا ئەگـەر پرسـیاریان لـە ئـەبی سـەعدە بکردایـە دەیـوت: پیـاوێکی پـیری تووشـی فیتنـە بووم و دوعاکەی سەعدم لێ گیرا بووە. عبدالملك دەفەرموێت: خـۆم بە چاوی خـۆم بینـیم دوای ئـەوەی لـە پیریـدا هـەردوو بـرۆی تـەپیبوون بەسـەر**

(٣) البخاري برقم ١٣٩٥، ٢٤٤٨.

(١) البخاري ٢/٢٣٦ برقم ٧٥٥ ومسلم ١/٣٣٤ برقم ٤٥٣، وهو أسامة بن قتادة يكنى أبا سعدة.

چـاوەکانیدا سـەرە ڕێگـای لـە ئافرەتـە کەنیزەکـەکان دەگـرت و دەسـتی بـۆ دەبردن.

وە أروی کچی أویس لەگەڵ سعیدی کوڕی زید(ڕەزای خوای لێ بێت) کێشـەیەکیان لە نێواندا هەبوو چوونە لای مەروانی کوڕی الحکم، جا ئەو ئافرەتە بانگەشـەی ئـەوەی دەکـرد کـە سـەعید شـتێك لـە زەوییەکـەی لێ داگـیر کـردووە، ئـەویش فـەرموی: ئایـا مـن شـتێك لـە زەوی ئـەو ئەبـەم بـۆ خـۆم دوای ئـەوەی کـە لـە پێغەمبـەری خـوام(ﷺ) بیسـتووە؟ فـەرموی: چـیت بیسـتووە لـە پێغەمبـەری خوا(ﷺ)؟ فەرموی: بیستوومە لە پێغەمبـەری خـوا(ﷺ) کە فەرمویـەتی: "من أخذ شبراً من الأرض بغير حقه طُوِّقه إلى سبعين أرضين" واتـە: هەرکەسێك بستێك لە زەوی هەرکەسێك داگیر بکـات بـە بـێ هـەقی خـۆی، ئـەوا خـوای گـەورە تـەوقی دەکـات لـە حـەفتا زەویـدا. پاشـان فـەرمووی: (اللهم إن كانت كاذبة فأعم بصرها، واجعل قبرها في دارها) واتە: خوایە ئەگەر درۆ دەکات چاوەکانی کوێر بکـەیت و لە ماڵی خۆیدا لە گۆڕی بنێیت. دەفەرموێت: بینیم ئەو ئافرەتە کوێر بـوو بـوو دەستی بە دیوارەکانـەوە دەگـرت و دەیـووت: (أصابتني دعوة سعيد بن زيد) واتـە: دوعاکەی سەعیدی کوڕی زەیدم لێ گیرا بـووە. جا ڕۆژێـك لـە ماڵـەوە دەڕۆیشـت بەسەر بیرەکەدا ڕۆیشت و کەوتە ناوییەوەو بوو بە گۆڕی.[1]

وعن أبي هريرة(رضي الله عنه) قال: قال رسول الله(ﷺ): "دعوة المظلوم مستجابة وإن كان فاجراً ففجوره على نفسه".[2]

واتە: پاڕانەوەی کەسی ستەم لێ کراو گیرایـە، ئەگەرچـی فاجر(تاوانبـار)یش بێـت ئەوە فجورەکەی بۆ خۆیەتی.

---

(١) مسلم برقم ١٦١٠، ٢/١٢٣٠.

(٢) أحمـد ٢/٣٦٧، وأبـو داود الطيالسـي فـي مسـنده بـرقم ١٢٦٦، وحسـنه الألبـاني فـي سلسـلة الأحاديث الصحيحة ٢/٤٠٧ برقم ٧٦٧، وفي صحيح الجامع ٣/١٤٥ برقم ٣٣٧٧.

هەندێکیش بە هۆنراوە ووتویانە:

لا تظلمنَّ إذا ما كنت مُقتدراً فالظالم آخره يأتيك بالندم

نامت عيونك والمظلوم منتبه يدعو عليك وعين الله لم تنم

واتە: ئەگەر دەستەڵاتت هەبوو وە دەستت دەڕۆیشت ستەم لە کەس نەکەیت، چونکە سەرەنجامی ستەمکاریی‌یەکەت پەشیمانی‌یە، تۆ چاوەکانت دادەخەیت و بەشەو دەنویت لە کاتێکدا کەسی ستەم لێکراو بەخەبەرە، وە دوعات لێ دەکات و چاوی خوای گەورەش نانوێت و بە ئاگایە.

٣ . پاڕانەوەی باوك بۆ منداڵی بە چاکە.

٤ . پاڕانەوەی باوك لە منداڵی بە خراپە.

٥ . پاڕانەوەی موسافیر:

عن أبي هريرة(رضي الله عنه) قال: قال رسول الله(ﷺ): "ثلاث دعوات يُستجاب لهن لا شك فيهن: دعوة المظلوم، ودعوة المسافر، ودعوة الوالد لولده"[1] وفي رواية أحمد والترمذي: "على ولده".[2]

واتە: سێ پاڕانەوە هەن وەلأم دەدرێنەوەو هیچ گومانی تێدا نی‌یە: پاڕانەوەی ستەم لێ کراو، وە پاڕانەوەی موسافیر(ئەو کەسەی لە سەفەردایە)، وە پاڕانەوەی باوك بۆ منداڵی خۆی بە چاکە. وە لە ڕیوایەتەکەی ئەحمەد و ترمذي دا: پاڕانەوەی باوك لە منداڵی بە خراپە.

جا کەواتە پێویستە ئاگاداری پاڕانەوەی ئەو کەسانە بین، چونکە پاڕانەوەیان گیرایە.

٦ . پاڕانەوەی ڕۆژووەوان:

---

(١) الترمذي ٣١٤/٤ برقم ١٩٠٥، ٥٠٢/٥، برقم ٣٤٤٨، وأبو داود ٨٩/٢، وابن ماجه ١٢٧٠/٢، وحسنه الألباني في صحيح أبي داود ٢٨٦/١، وفي صحيح الترمذي ١٥٦/٣ وصحيح ابن ماجه ٣٣١/٢.

(٢) الترمذي ٥٠٢/٥، برقم ٣٤٤٨، وأحمد ٢٥٨/٢.

عن أبي هريرة يرفعه: "ثلاثة لا ترد دعوتهم: الصائم حتى يفطر، والإمام العادل، ودعوة المظلوم يرفعها الله فوق الغمام، ويَفتَحُ لها أبواب السماء ويقول الرب: وعزتي لأنصرنك ولو بعد حين". [٣]

واتـه: سـێ کـەس هـەن دوعایـان ڕەت ناکرێتـەوە: ڕۆژووەوان هـەتا بـەربانگ دەکاتەوە، وە پێشەوای دادپـەروەر، وە پاڕانەوەی ستەملێکراو، خـوای گـەورە بـەرزی دەکاتـەوە بەسـەر هەورەکانـداو دەرگاکـانی ئاسمـانی بـۆ دەکاتـەوەو پـەروەردگار دەفـەرموێت: بە عیززەتـی خـۆم سـەرت دەخـەم ئەگـەر چی پێشـی بچێت.

٧ - پاڕانەوەی ڕۆژووەوان هەتا بەربانگ دەوکاتەوە.

٨ - پێشەوای دادپەروەر:

لـە ئـەبو هـورەیرەوە(ڕەزای خـوای لێ بێـت) لـە فەرمودەیـەکی دوورو درێـژدا لـە پێغەمبـەری خـواوە(ﷺ) کـە دەربـارەی سـیفەت و نیعمەتـەکانی بەهەشـت فەرمویـەتی، لـە کۆتایییەکەی‌ـدا دەفـەرموێت: "... ثلاثة لا تُردُّ دعوتهم: الإمام العادل، والصائم حين يفطر، ودعوة المظلوم يرفعها فوق الغمام، وتُفَتَّحُ لها أبواب السماء، ويقول الربُّ عز وجل: وعزتي لأنصرنك ولو بعد حين". [١]

واتـه: سـێ کـەس پاڕانـەوەیان ڕەت ناکرێتـەوە: پێشـەوای دادپـەروەر، وە ڕۆژووەوان کاتێ بەربانگ دەکاتەوە، وە پاڕانەوەی ستەم لێ کراو، خوای گەورە بـەرزی دەکاتـەوە بەسـەر هەورەکانـداو دەرگاکـانی ئاسمـانی بـۆ دەکاتـەوەو پـەروەردگار دەفـەرموێت: بە عیززەتـی خـۆم سـەرت دەخـەم ئەگـەر چی پێشـی بچێت.

---

(٣) الترمذي بلفظه ٥/٥٧٨، برقم ٣٥٩٨ ورواه الترمذي بإسناد آخر بعد شيخه عن أبي هريرة رضي الله عنه ولكن قال: "الصائم حين يفطر" ٤/٦٧٢ برقم ٢٥٢٦ وصححه الألباني في صحيح سنن الترمذي ٢/٣١١، وابن ماجه ١/٥٥٧، وأخرجه أيضاً البغوي ٥/١٩٦.

(١) الترمذي ٤/٦٧٢، برقم ٢٥٢٦، وصححه الألباني في صحيح الترمذي ٢/٣١١.

وعن عبد الله بن عمرو(رضي الله عنهما) يرفعه: "إن للصائم عند فطره لدعوةً ما تُرد".[٢]

**واتــه: ڕۆژووەوان كــاتى بــەربانگ كردنــەوەى پاڕانەوەيــەكى هەيــە ڕەت ناكرێتەوە.**

وعن أبي هريرة(رضي الله عنه) يرفعه: "ثلاثة لا يُردُّ دعاؤُهم: الذاكر الله كثيراً، ودعوة المظلوم، والإمام المُقسِط".[١]

**واتە: سىٚ كەس پاڕانەوەيان ڕەت ناكرێتەوە: ئەو كەسەى زۆر يادى خواى گەورە دەكات، وە پاڕانەوەى ستەم لىٚ كراو، وە پێشەواى دادپەروەر.**

**٩ . پاڕانەوەى مندالّى صالّح:**

لحديث أبي هريرة(رضي الله عنه) يرفعه: "إذا مات الإنسان انقطع عمله إلا من ثلاث: إلا من صدقةٍ جاريةٍ، أو علمٍ ينتفع به، أو ولدٍ صالحٍ يدعو له".[٢]

**واتە: كاتىٚ مرۆڤ مرد كردارەكانى دەوەستێت جگە لە سىٚ ڕێگا: چاكەيەكى بەردەوام، يان زانستێك سوودى لىٚ ببينرێت، يان مندالّێكى صالّح كە بپاڕێتەوە بۆى.**

**١٠ . پاڕانەوەى كەسێك لە خەو هەستێت بە شەوداو بپاڕێتەوە بە نزاى ئەو كاتە:** عن عبادة بن الصامت(رضي الله عنه) عن النبي(ﷺ) أنه قال: "من تعارَّ من الليل فقال: لا إله إلا الله وحده لا شريك له، له الملك وله الحمد وهو على كل شيء قدير، الحمد لله، وسبحان الله، ولا إله إلا الله والله أكبر، ولا حول ولا قوة إلا بالله ثم قال: اللهم اغفر لي أو دعا استُجيب [له] [فإن عزم فتوضأ ثم صلى قبلت صلاته]".[٣]

---

(٢) ابن ماجه ١/٥٥٧ وحسنه الحافظ في تخريج الأذكار ٣٤٢/٤. [بەلاّم شێخى البانى بە ضەعيفى داناوە بڕوانە ضعيف الجامع ژمارە ١٩٦٥–وەرگێڕ].

(١) البيهقي في الشعب ٣٩٩/٢، وحسنه الألباني في سلسلة الأحاديث الصحيحة ٢١٢/٣ برقم ١٢١١.

(٢) مسلم ١٢٥٥/٣.

(٣) البخاري برقم ١١٥٤ والترمذي بلفظه إلا قوله: اللهم فإنها عنده "ربِّ" برقم ٣٤١٤.

واته: هەرکەسێك بەشەو بەخەبەر هات بڵێت: ( لا إلهَ إلاّ اللهُ وَحْدَهُ لا شَريكَ لَهُ. لهُ المُلكُ ولَهُ الحَمْدُ وهوَ عَلَى كُلِّ شيءٍ قَدير. الحَمدُ للهِ وسُبحان اللهِ، وَلا إلهَ إلاّ اللهَ، وَاللهُ أكبرُ. وَلا حَولَ وَلا قُوةَ إلاّ باللهِ) پاشان بپاڕێتەوەو بڵێ (اللهم اغفِرلي) خوایە گوناهەکانم ببۆشە. یان ئەگەر بپاڕێتەوە ئەوا وەڵامی دەدرێتەوەو ئەگەر هەڵسێت و دەست نوێژ بشۆریٚو پاشان نوێژ بکات نوێژەکەی وەردەگیرێ.

١١ . پاڕانەوەی لێقەوماوو بێ دەرەتان (المُضطَر):

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿أمَّن يُجيبُ المضطَرَّ إذا دعَاهُ ويكشِفَ السُّوءَ...﴾.[1]

واتە: ئایا کێیە جگە لە زاتی پەروەردگار کە بێت بە هاناو هاواری لێقەوماو و بێ دەرەتان و بێ داڵدەوە، کاتێك نزا دەکات و لێی دەپاڕێتەوە، ئەوسا بەڵاو ناخۆشیەکان لادەبات.

وە لەو بەڵگانەی لەسەر ئەوەی کە بە هێزترین هۆکاری وەڵامدانەوە بریتیە لە پێگیران و نارەحەتی، فەرمودەکەی ئەو سێ کەسەی دەچنە ئەشکەوتەکەوەو بەردێکی گەورە دەمی ئەشکەوتەکە دەگرێت، وە بە یەکتری دەڵێن: بیربکەنەوەو بگەڕێن لە کردارێکی چاك کە کردبێتان و تەنها مەبەستتان خوای گەورە بوو بێت، وە لە خوای گەورە بپاڕێنەوە پێی بەڵکو خوای گەورە دەرووتان لێ بکاتەوە. ئەوانیش بە چاکترین کردەوەی خۆیان پاڕانەوەو سەرەنجام بەردەکە لاچوو هاتنە دەرەوە.[2]

وعن عائشة(رضي الله عنها) أن وليدة كانت سوداء[3] لحيٍّ من العرب فأعتقوها فكانت معهم. قالت: فخرجت صبية لهم عليها وشاح أحمر من سيور، قالت فوضعته أو وقع منها

---

(٤) سورة النمل، الآية: ٦٢.

(٢) البخاري، كتاب الأدب، باب إجابة دعاء من بر والديه، برقم ٥٩٧٤، ومسلم ٢٠٩٩/٤.

(٣) وفي رواية للبخاري في حديث رقم ٣٨٣٥ "أسلمت امرأة سوداء لبعض العرب".

فمرت به حُديّاة[٤] وهو ملقى فحسبته لحماً فخطفته قالت: فطفقوا يفتشوا حتى فتشوا قُبُلها. قالت: والله إني لقائمة معهم إذ مرت الحديّاةُ فألقته، قالت: فوقع بينهم. قالت: فقلت هذا الذي اتهمتموني به زعمتم وأنا منه بريئة وهوذا، قالت فجاءت إلى رسول الله (ﷺ) فأسلمت. قالت عائشة فكانت لها خباء في المسجد أو حفش[٥] قالت فكانت تأتيني فتحدث عندي، قالت: لا تجلس عندي مجلساً إلا قالت:

ويوم الوشاحِ من تعاجيبِ ربِّنا

ألا إنه من بلدةِ الكفر أنجاني

قالت عائشة: فقلت لها: ما شأنك لا تقعدين معي مقعداً إلا قلت هذا؟ قالت: فحدثتني بهذا الحديث[١]

**واته: ئافرەتێكی كەنیزەی ڕەش پێست لە یەكێك لە تیرەكانی عەرەب موسڵمان بـوو ئـەوانیش ئازادیـان كـرد، ئـیتر لەگـەڵیان بـوو، دەفـەرموێت: منـداڵێكیان ملپێچێكی سـووری مـورورداری پێبـوو، دەفـەرموێت: خسـتی یـان لێـی كـەوت، قەلەباچكەیەك بە لایدا تێپەڕی لە كاتێكدا پارچە قوماشەكە لەسەر زەوییەكە كـەوتبوو وای زانـی پارچـە گۆشـتە، ئـیتر فڕانـدی، ئـەوانیش هـەموو گیـانی ئافرەتـە كەنیزەكـە گـەڕان بـە دوایـدا بـە جۆرێـك تەفتیشـی عەورەتیشـیان كـرد، دەفەرموێت: سوێند بە خوای گەورە من هێشتا بە پێوە وەستا بووم لەگـەڵیان ئەوەندەم زانی قەلەباچكەكە هێنایەوەو فڕێی دایەوە بۆیان، وە كەوتە ناویان. ئافرەتەكـە دەفـەرموێت: ووتم ئـا ئـەوەتانێ كـە ئێـوە تۆمـەتبارتان كـردم بـە دزیێی‌و واتان دانا كە من دزیومـە لەكاتێكدا من بـەری بووم لـەو تاوانـەو ئـەوەتا بۆتان هاتەوە، دەفەرموێت: ئیتر هاتە لای پێغەمبەری خوا(ﷺ) و موسڵمان بوو،**

---

(٤) وفي رواية البخاري "الحُديا" رقم ٣٨٣٥.

(٥) الحفش:ماڵێكی تەسكی بچوكە.

(١) البخاري برقم ٤٣٩، و٣٨٣٥.

**عائیشـه(ڕەزای خـوای لێ بێـت) دەفـەرموێت: جـا لـە نـاو مزگەوتـدا خانۆچـکەیەکی بچـوکی لـە خـوری چـنراوی هـەبوو، دەفـەرموێت: ئـیتر ئەهاتـە لام و لـە منـەوە فەرمودەی دەگێڕایەوە، عائیشە(ڕەزای خوای لێ بێت) دەفەرموێت: هـیچ کـات لـە لام دانەدەنیشـت ئـیلا دەیـوت: ئـەو ڕۆژەش کـە پارچـە پەڕۆکـەیان دامـێ لـە شـتە سەرسوڕهێنەرەکانی خوای گەورە بوو، ئەوە بوو بە هۆیەوە لـە شاری کوفرو بـێ بڕوایی ڕزگاری کردم، عائیشە(ڕەزای خـوای لێ بێـت) دەفـەرموێت: پـێم ووت: بۆچـی هـیچ کـات دانانیشـیت لـە لام ئـیلا ئەمـە دەڵێیـت؟ دەفـەرموێت: ئـیتر ئـەویش ئـەم بەسەرهاتەی خۆی بۆ گێڕامەوە.**

**جا ئەمـە بـووە هـۆی موسـڵمان بـوونی ئـەو ئافرەتـە، بۆیـە ئـەگونجێت شـتێك بـە ڕواڵەت بە لای خەڵکەوە زیاندارو خراپ بێت لـە کاتێکدا لـە ڕاستیدا بە سـوودو چاك بێت.**

**١٢ . پاڕانەوەی ئەو کەسەی بە دەست نوێـژەوەو لەسـەر زیکـری خـوای گـەورە دەچێتە جێگاو دەخەوێت:**

عن معاذ بن جبل(رضي الله عنه) عن النبي(ﷺ) قال: "ما من مسلم يبيتُ على ذكر الله طاهراً فيتعارَّ من الليل فيسأل الله خيراً من الدنيا والآخرة إلا أعطاه الله إياه".[1]

**واتـە: هـیچ موسـڵمانێك نییـە کـە لەسـەر زیکـری خـوای گـەورەو بـە پـاکیو بـە دەستنوێژەوە بنوێت و لەشەودا بە خەبەر بێـت و داوای هـەر خێرێکـی دونیـاو قیامەت لە خوای گەورە بکات ئیلا خوای گەورە پێی دەبەخشێت.**

**١٣ . پاڕانەوەی ئەو کەسەی بپاڕێتەوە بە دوعاکەی یونس پێغەمبـەر**(عليه الصلاة والسلام):

---

(١) أبو داود برقم ٥٠٤٢، وأحمد ١١٤/٤ وصححه الألباني في صحيح أبي داود ٩٥١/٣، وصحيح الترغيب والترهيب ٢٤٥/١.

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَذَا النُّونِ إِذ ذَّهَبَ مُغَاضِبًا فَظَنَّ أَن لَّن نَّقْدِرَ عَلَيْهِ فَنَادَى فِي الظُّلُمَاتِ أَن لا إِلَهَ إِلا أَنتَ سُبْحَانَكَ إِنِّي كُنتُ مِنَ الظَّالِمِينَ، فَاسْتَجَبْنَا لَهُ وَنَجَّيْنَاهُ مِنَ الْغَمِّ وَكَذَلِكَ نُنجِي الْمُؤْمِنِينَ﴾.(٢)

واتە: یادی (ذو النون)یش بکەرەوە (کە یونس پێغەمبەرە) کاتێك بە توڕەیی یەوە ڕۆیشت، گومانی وابوو کە هەرگیز دنیای لێ تەنگ ناکەینەوە (بەڵام بە پێچەوانەی گومانەکەیەوە خوا خستیە ناو سکی نەهەنگەوە)، جا لە ناو تاریکایەکاندا، (تاریکای شەوو دەریا و ناوسکی نەهەنگەکەدا) هاوارو نزای لێ بەرز بویەوەو وتی: پەروەردگارا هیچ پەرستراوێك نییە بە هەق جگە لە تۆ، پاکی و بێگەردی هەر بۆ تۆیە، بەڕاستی من لە ستەمکاران بووم (کاتێك بە بێ فەرمانی تۆ قەومەکەم بەجێهێشت). ئێمەش بەهانایەوە چووین و ڕزگارمان کرد لەو غەم و پەژارەو تەنگانەیەی کە تێی کەوتبوو، بەو شێوەیەش ئیمانداران ڕزگار دەکەین (کاتێك کە دەکەونە تەنگانەوەو هاناو هاوار بۆ ئێمە دەهێنن).

عن سعيد بن أبي وقاص(رضي الله عنه) قال: قال رسول الله(ﷺ): "دعوة ذِي النون إذ دعا بها وهو في بطن الحوت: لا إله إلا أنت سبحانك إني كنت من الظالمين، فإنه لم يدع بها رجلٌ مسلمٌ في شيء قط إلا استجاب الله له".(١)

واتە: پاڕانەوەکەی (ذي النون) (یونس پێغەمبەر(عليه الصلاة والسلام) کە کاتێك لە سکی حوتەکەدا بوو فەرموی: (لا إله إلا أنت سبحانك إني كنت من الظالمين) هیچ پیاوێکی موسڵمان نییە کە پێی بپاڕێتەوە بۆ هەر شتێك ئیلا خوای گەورە وەڵامی دەداتەوە.

---

(٢) سورة الأنبياء، الآيتان: ٨٧، ٨٨.

(١) أخرجه الترمذي ٥/٥٢٩، وأحمد في المسند ١/١٧٠، والحاكم ١/٥٠٥، وصححه ووافقه الذهبي، قال عبد القادر الأرناؤوط في تخريج الكلم: ص٨٦: وهو كما قالا. وحسنه ابن حجر، وصححه الألباني في صحيح الترمذي ٣/١٦٨، وانظر: ص٥٦، وص٧٩ من هذا الكتاب.

**١٤ . پاڕانەوەی ئەو کەسەی توشی موسیبەتێك بووەو پاڕاوەتەوە بە نزای ئەو کاتە:**

عن أم سلمة(رضي الله عنها) قالت: سمعت رسول الله(ﷺ) يقول: "ما من عبد تصيبه مصيبة فيقول: إنا لله وإنا إليه راجعون، اللهم أْجُرني في مصيبتي وأَخْلِف لي خيراً منها إلا آجره الله في مصيبته وأخلف له خيراً منها". قالت: فلما توفي أبو سلمة قلت كما أمرني رسول الله(ﷺ) فأخلف لي خيراً منه. رسول الله(ﷺ).[٢]

**واتە: هیچ بەندەیەك نییە کە تووشی موصیبەتێك دەبێت و بڵێت:** (إنا لله وإنا إليه راجعون، اللهم أْجُرني في مصيبتي وأَخْلِف لي خيراً منها إلا آجره الله في مصيبته وأخلف له خيراً منها) **ئیلا خوای گەورە لەسەر ئەو موصیبەتە پاداشتی دەداتەوەو کەسێکی باشتری بۆ دەخاتەوە جێگای. دەفەرموێت: کاتێ ئەبو سەلەمە وەفاتی کرد هەروەك ئەوەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرمانی پێکردبووم ووتم، خوای گەورەش کەسێکی چاکتری بۆ خستمەوە شوێنی کە بریتی بوو لە پێغەمبەری خوا(ﷺ).**

**١٥ . پاڕانەوەی ئەو کەسەی بە ناوە گەورەکەی خوای گەورە دەپاڕێتەوە:**

عن عبد الله بن بريدة عن أبيه قال: سمع النبي(ﷺ) رجلاً يدعو وهو يقول: اللهم إني أسألك بأني أشهد أنك أنت الله لا إله إلا أنت الأحد الصمد الذي لم يلد ولم يولد، ولم يكن له كفواً أحد، قال فقال: "والذي نفسي بيده لقد سأل الله باسمه الأعظم الذي إذا دُعي به أجاب، وإذا سُئل به أعْطى".[١]

**واتە: پێغەمبەری خوا(ﷺ) گوێی لە پیاوێك بوو دەپاڕایەوەو دەیوت:** (اللهم إني أسألك بأني أشهد أنك أنت الله لا إله إلا أنت الأحد الصمد الذي لم يلد ولم يولد،

---

(٢) مسلم ٦٣٢/٢ برقم ٩١٨.

(١) الترمذي ٥١٥/٥ وأبو داود ٧٩/٢، وأحمد ٣٦٠/٥، وابن ماجه ١٢٦٧/٢، والحاكم ٥٠٤/١، وصححه الألباني في صحيح الترمذي ١٦٣/٣.

ولم يكن له كفواً أحد) **پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرمووی: سوێند بەو خوایەی نەفسی منی بەدەستە بەو ناوە گەورەیەی خوای گەورە پاڕایەوە کە ئەگەر پێی بپاڕێیتەوە وەڵام دەدرێیتەوەو ئەگەر داوای پێ بکەیت پێت دەبەخشرێت.**

وعن أنس(رضي الله عنه) أنه كان مع رسول الله(ﷺ) جالساً ورجل يصلي ثم دعا: اللهم إني أسألك بأن لك الحمد لا إله إلا أنت، المنان، بديع السماوات والأرض، يا ذا الجلال والإكرام، يا حي يا قيوم. فقال النبي(ﷺ): "لقد دعا الله باسمه العظيم الذي إذا دُعي به أجاب وإذا سُئل به أعطى". [2]

**واتە: ئەنەس لەگەڵ پێغەمبەری خوادا(ﷺ) دانیشتبوو، پیاوێکیش نوێژی کرد پاشان پاڕایەوەو ووتی:** (اللهم إني أسألك بأن لك الحمد لا إله إلا أنت، المنان، بديع السماوات والأرض، يا ذا الجلال والإكرام، يا حي يا قيوم) **پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرمووی: بە ناوە گەورەکەی خوای گەورە پاڕایەوە کە ئەگەر پێی بپاڕێیتەوە وەڵام دەدرێیتەوەو ئەگەر داوای پێ بکەیت پێت دەدرێت.**

**١٦ ـ پاڕانەوەی ئەو منداڵەی چاکە لەگەڵ دایك و باوکیدا:**

عن مالك عن يحيى بن سعيد أن سعيد بن المسيب كان يقول: إن الرجل ليرفع بدعاء ولده من بعده وقال بيده نحو السماء فرفعهما. [1]

**واتە: سەعیدی کوڕی المسیب دەیفەرموو: پیاوی وا هەیە بە هۆی پاڕانەوەی کوڕەکەی خۆیەوە دوای مردنی خۆی پلەی بەرز دەبێتەوە، وە دەستەکانی بەرەو ئاسمان بەرز کردەوە.**

---

(٢) أبو داود ٢/٨٠، والترمذي ٥/٥٥٠، وابن ماجه ٢/١٢٦٨، والنسائي ٣/٥٢، وصححه الألباني في صحيح النسائي ١/٢٧٩.

(١) أخرجه الإمام مالك ١/٢١٧ وقال المحقق عبد الباقي: قال ابن عبد البر هذا لا يدرك بالرأي وقد جاء بسند جيد.

وعن أبي هريرة(رضي الله عنه) قال: قال رسول الله(ﷺ): "إن الله ليرفع الدرجة للعبد الصالح في الجنة فيقول: يا ربِّ أنَّى لي هذه ؟ فيقول باستغفار ولدك لك".[٢]

واتە: خوای گەورە پلەی بەندەیەكی چاك بەرز دەكاتەوە لە بەهەشتدا. پیاوەكە دەڵێ: ئەی پەروەردگارم ئەمەم لە كوێ بوو؟ خوای گەورە دەفەرموێت: بە هۆی داوای لێخۆشبوون بۆ كردنی كوڕەكەتەوە بوو بۆت.

وعن أبي هريرة(رضي الله عنه) أن رسول الله(ﷺ) قال: "إذا مات الإنسان انقطع عمله إلا من ثلاثة: إلا من صدقة جارية، أو علم ينتفع به، أو ولد صالح يدعو له".[٣]

واتە: كاتێ مرۆڤ مرد سەرجەم كردارەكانی دەوەستێت جگە لە سێ ڕێگا: چاكەیەكی بەردەوام، یان زانستێك سوودی لێ ببینرێت، یان منداڵێكی صاڵح كە بپاڕێتەوە بۆی.

وە لەو بەڵگانە: فەرمودەكەی ئەو سێ كەسەی بەردەكە بەردەم ئەشكەوتەكەی گرتن، پیاوێكیان چاكەخواز بوو لەگەڵ دایك و باوكیدا بەو كردەوە چاكەیە تەوەسولی كردو پاڕایەوە، خوای گەورەش پاڕانەوەكەی گیرا كرد.[١]

وە لەوانە هەواڵدانی پێغەمبەری خوا(ﷺ) بە چاكترین كەسی تابعین وە فەرموی: كەسێكە ئەگەر سوێند لەسەر خوای گەورە بخوات گیرای دەكات، وە هۆكارەكەشی ئەوەبوو دایكێكی هەبوو ئەم لەگەڵی چاك بوو.

فعن عمر بن الخطاب(رضي الله عنه) قال: سمعت رسول الله(ﷺ) يقول: "يأتي عليكم أويس بن عامر مع أمداد أهل اليمن، من مراد، ثم من قرن، كان به برص فبرأ منه إلا موضع درهم، له والدة هو بها بر، لو أقسم على الله لأبره، فإن استطعت أن يستغفر لك فافعل".[٢]

---

(٢) أخرجه أحمد في المسند ٥٠٩/٢، وصحح إسناده ابن كثير في تفسيره، ٢٤٣/٤.

(٣) أخرجه مسلم ١٢٥٥/٣ في كتاب الوصية باب ما يلحق الإنسان من الثواب بعد وفاته رقم ١٦٣١.

(١) البخاري ٣٧/٤ ومسلم ٢٠٩٩/٤.

(٢) أخرجه مسلم ١٩٦٨/٤ في كتاب فضائل الصحابة باب فضائل أويس القرني رقم ٢٥٤٢.

واتە: وەیسی کوڕی عامر لەگەڵ کۆمەڵێك لە خەڵکی یەمەن کە لە (موراد)پاشان لە (قرن)ە دێنە لاتان و ئەو پیاوە نەخۆشی بەڵەکی هەبووە، خوای گەورە شیفای داوەو تەنها بە ئەندازەی درهەمێکی پێوە ماوە، دایکێکی هەیەو ئەم لەگەڵیدا زۆر چاکە، ئەگەر سوێند لەسەر خوای گەورە بخوات خوای گەورە بۆی جێبەجێ دەکات، جا ئەگەر توانیت پێی بگەیت و داوای لێخۆشبوونت بۆ بکات لە خوای گەورە ئەوا بیکە.

١٧ ـ پاڕانەوەی کەسێك لە حەجدا بێت.

١٨ ـ پاڕانەوەی کەسێك لە عەمرەدا بێت:

١٩ ـ پاڕانەوەی ئەوەی لە غەزادایە لە پێناوی خوادا:

لەبەر فەرمودەکەی ابن عمر(ڕەزای خوای لێ بێت): عن النبي(ﷺ) قال: "الغازي في سبيل الله، والحاج، والمعتمر وفد الله: دعاهم فأجابوه، وسألوه فأعطاهم".(٣)

واتە: غەزا کاری ڕێگای خوا، وە حاجی و عەمرەکار وەفدی خوای گەورەن بانگی کردن وەڵامیان دایەوە، وە ئەوانیش داوایان لێکرد پێی بەخشین.

٢٠ ـ پاڕانەوەی ئەو کەسەی زۆر یادی خوای گەورە دەکات:

عن أبي هريرة(رضي الله عنه) عن النبي(ﷺ) قال: "ثلاثة لا يُردُّ دُعاؤُهم: الذاكر لله كثيراً، ودعوة المظلوم، والإمام المقسط".(١)

واتە: سێ کەس پاڕانەوەیان ڕەت ناکرێتەوە: ئەو کەسەی زۆر یادی خوای گەورە دەکات، وە پاڕانەوەی ستەم لێکراو، وە پێشەوای دادپەروەر.

٢١ ـ پاڕانەوەی ئەو کەسەی خوای گەورە خۆشی دەوێت و لێی ڕازییە:

---

(٣) ابن ماجه برقم ٢٨٩٣، وحسنه الألباني في صحيح ابن ماجه ٢/١٤٩، وسلسلة الأحاديث الصحيحة برقم ١٨٢، ٤/٤٣٣.

(١) أخرجه البيهقي في شعب الإيمان ٢/٣٩٩، والطبراني في الدعاء برقم ١٢١١، وحسنه العلامة الألباني في سلسلة الأحاديث الصحيحة ٣/٢١١ برقم ١٢١١.

عن أبي هريرة(رضي الله عنه) قال: قال رسول الله(ﷺ): "إن الله تعالى قال: من عادى لي ولياً فقد آذنته بالحرب، وما تقرب إليَّ عبدي بشيء أحبّ إليَّ مما افترضته عليه، وما يزال عبدي يتقرب إلي بالنوافل حتى أحبه، فإذا أحببته كنت سمعه الذي يسمع به، وبصره الذي يبصر به، ويده التي يبطش بها، ورجله التي يمشي بها، وإن سألني لأعطينّه، ولئن استعاذني لأعيذنه، وما ترددت عن شيء أنا فاعله ترددي عن نفس المؤمن يكره المؤت وأنا أكره مساءَتهُ". (٢)

**واتـه: خـوای گـەروه دەفـەرموێت: هەركەسـێك دوژمنايـەتی دۆسـتێكی مـن بكـات ئيعلانـی جـەنگی لەگەڵدا دەكـەم. وه بەنـده بـه هـيچ شـتێك لـه مـن نزيـك نابێتـەوه خۆشەويستر بێت لەوەی كه فەرزم كردووه له سەری، وه بەردەوام بەندەكەم خۆی نزيك دەكاتەوه لێم به ئەنجامدانی سوننەتەكان هەتا وای لیٚ دێت خۆشم دەوێت، كاتیٚ خۆشـم ويسـت دەبمـه ئـەو گوێيـەی پێـی دەبيسـتێت، وه ئـەو چاوەی پێـی دەبينێت، وه دەستی كه پێی دەگرێت و قاچی كه پێـی دەڕوات، وه ئەگـەر داوام لیٚ بكـات پێـی دەبەخشـم، وه ئەگـەر پـەنام پـیٚ بگرێـت پـەنای دەدەم، وه لـه هـيچ شـتێك مـتردد نـەبووم كـه كردبێتم وەك تـرددم بـۆ كێشـانی گيـانی ئيمانـدار كـاتیٚ حـەز بـه مـەرگ ناكـات و پێـی ناخۆشـەو منـيش ناخۆشـی و ناڕەحـەتی ئـەوم پـیٚ ناخۆشه.**

**وه ئـەم كەسـه خۆشەويسـتەی لای خـوای گـەوره پلەيـەكی گـەورەی هەيـە، كـاتیٚ داوای شـتێك لـه خـوای گـەوره دەكـات پێـی دەبەخشـێت، وه ئەگـەر پـەنای پـیٚ بگرێت له شتێك پەنای دەدات، وه ئەگەر لێـی بپاڕێتـەوه وەڵامـی دەداتـەوه، بۆيـه دەبێته كەسێكی پاڕانەوه گيرا بوو به هۆی رێزی لای خـوای گـەوره. بۆيـه زۆرێك له پێشينی چاك(السلف الصالح) ناسراو بوون به گيرا بوونی پاڕانەوه.** (١)

---

(٢) البخاري، كتاب الرقاق، باب التواضع برقم ٦٥٠٢.

(١)انظر: جامع العلوم والحكم ٣٤٨/٢.

وفي الصحيحين أن الرُّبيِّع بنت النضر كسرت ثنية جارية فعرضوا عليهم الأرش فأبوا، فطلبوا منهم العفو فأبوا، فقضى بينهم رسول الله(ﷺ): بالقصاص، فقال أنس بن النضر: أتُكسر ثنية الرُّبيِّع؟ والذي بعثك بالحق لا تكسر ثنيتها، فرضي القوم وأخذوا الأرش، فقال رسول الله(ﷺ): "إن من عباد الله من لو أقسم على الله لأبره".[٢]

واته: ربيعى كچى النضر(ڕەزای خوای لێ بێت) ددانێكی پێشەوەی جارییەكی شكاندو ئەوانیش هەق و خوێنەكەیان خستە ڕووی كەسوكارەكەی بەڵام ئەوان ڕەتیان كردەوەو ڕازی نەبوون، داوای لێبوردنیان كرد هەر ڕەتیان كردەوە. پێغەمبەری خوا(ﷺ) لە نێوانیاندا بڕیاریدا بە تۆڵە كردنەوە(القصاص)، ئەنەسی كوڕی نەضری برای(ڕەزای خوای لێ بێت) فەرمووی: ددانی ربیع دەشكێننەوە؟ سوێند بێت بەو خوایەی بە حەق ڕەوانەی كردویت ددانی ناشكێنرێتەوە، بۆیە ئیتر گەلەكە ڕازی بوون و خوێن و هەقەكەیان وەرگرت، پێغەمبەری خواش(ﷺ) فەرمووی: لە ناو بەندەكانی خوای گەورەدا كەسانێك هەیە ئەگەر سوێند بخوات لەسەر خوای گەورە خوای گەورە بۆی دێنێتە جێ.

وعن أنس(رضي الله عنه) عن النبي(ﷺ) قال: "كم من ضعيف متضعَّف[١] ذي طمرين لو أقسم على الله لأبره منهم البراء بن مالك"[٢]. ولفظه عند الترمذي: "كم من أشعث أغبر ذي طمرين[٣] لا يُؤْبَهُ لهُ[٤] لو أقسم على الله لأبرَّه منهم البراء بن مالك".[٥]

واتە: چەند كەسی لاوازی بە لاواز تەماشا كراوی جلو بەرگ شڕۆڵە هەیە كە ئەگەر سوێند بخوات لەسەر خوای گەورە بۆی دێنێتە دی، لەوانە (بەرائی

(٢) البخاري برقم ٢٧٠٣، ومسلم برقم ١٦٣٥ وغيرهما.

(١) واته: ئەو كەسەی خەڵكی بە لاوازی دەزانن و لە دونیادا خۆیان بە زل دەگرن بەسەریدا لەبەر هەژاریو حاڵ شڕۆڵەییەكەی.

(٢) الحاكم وصححه ووافقه الذهبي ٣/٢٩٢.

(٣) ذي طمرين: واته خاوەن دوو پۆشاكی ڕزیو و كۆن.

(٤) لا يؤبه له: واته هیچ گوێی پێ نادرێت و ئاوڕی بۆ نادرێتەوە.

(٥) الترمذي ٥/٦٩٣ برقم ٣٨٥٤، وقال صحيح حسن، وصححه الألباني في صحيح الترمذي ٣/٢٣٩.

کوڕی مالیك)ە، لەفزی ترمذی بەم جۆرەیە: چەند کەسی قژ ئاڵۆزکاوی تەپوتۆزاوی خاوەن دوو پۆشاکی دڕاو هەیە کە ئاوڕی بۆ نادرێتەوە ئەگەر سوێند بخوات لەسەر خوای گەورە بۆی دێنێتە دی، لەوانە برائی کوڕی مالیکە.

وە لە کاتی جیهاددا کە جەنگ قورس دەبوو لەسەر موسڵمانان دەیانووت: (یا براء أقسم علی ربك) واتە: ئەی بەراو سوێند لەسەر خوای گەورە بخۆ، ئەویش دەیوت: (یا رب أقسمت علیك لما منحتنا أکتافهم) واتە: خوایە سوێندت لەسەر دەخۆم ئیلا بەرزاییەکانیانمان پێ ببەخشە، ئیتر دوژمن دەشکا. جا کاتێ ڕۆژی جەنگی (تُستر) بوو فەرمووی: (أقسمت علیك یا رب لما منحتنا أکتافهم وجعلتني أول شهید). واتە: خوایە سوێندت لەسەر دەخۆم ئیلا بەرزاییەکانیانمان پێ ببەخشە و منیش بکەرە یەکەم شەهید، ئیتر بەرزاییەکانیان گرت و بەرائیش بە شەهیدی کوژرا.[٦]

جا ابن رجب (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) لە کتێبی (جامع العلوم والحکم) چەندین نمونە دەگێڕێتەوە لەسەر وەڵامدانەوەی خوای گەورە بۆ زۆرێك لە بەندە ئیمانـدارەکانی[١]. وە شێخی ئیسلام چەندین بەسەرهاتی گەورەی باس کردووە لە کتێبەکەیدا(الفرقان بین أولیاء الرحمن وأولیاء الشیطان).[٢] وە أبوبکر بن أبي الدنیاش لە کتێبی(کتاب مجابي الدعوة) بەسەرهاتی گەورەی باس کردووە.[٣]

---

(٦) أخرجه أبو نعیم في الحلیة ١/٣٥٠ وانظر: أسد الغابة ١/١٧٢، وابن کثیر في البدایة والنهایة ٧/٩٥.

(١) بڕوانە: جامع العلوم والحکم ص٣٤٨-٣٥٦.

(٢) ص٣٠٦-٣٢٠.

(٣) ذکر مائة وثلاثین إجابة ص١٧-١٨.

## بەشی حەوتەم: گرنگی پاڕانەوەو شوێن و پلە و پایەی لە ژیاندا:

### باسی یەکەم: هەژاری بەندەکان و پێویستی‌یان بە پەروەردگاریان:

سەرجەم دروستکراوان هەژارو ئاتاجن بۆ لای خوای گەورە لە بەخشینی بەرژەوەندی‌یەکانیان و لابردن و دوورخستنەوەی زیانەکان لە سەریان. لە هەموو لایەنەکانی دین و دونیایاندا. خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿يا أيها النَّاسُ أنتُمُ الفُقراءُ إلى اللهِ واللهُ هوَ الغنيُّ الحَميدُ﴾.(١)

---

(١) سورة فاطر، الآية: ١٥.

**واته: ئەی خەڵکینە ئێوە هەژارو نەدارن و هەمیشە ئاتاجی خوان، (لە هەموو کات و شوێنێکداو بۆ هەموو شتێك) هەر تەنها خوایە کە بێ نیازەو شایانی سوپاسە.**

**وە لەو بەڵگانەی ئەمە ڕوون دەکاتەوە فەرمودەکەی ئەبو ذەرە(ڕەزای خوای لێ بێت):**

عن النبي(ﷺ) فيما يرويه عن ربه عز وجل أنه قال: "يا عبادي إني حرمت الظلم على نفسي وجعلته بينكم محرماً فلا تظالموا، يا عبادي كلكم ضال إلا من هديته فاستهدوني أهدكم، يا عبادي كلكم جائع إلا من أطعمته فاستطعموني أطعمكم، يا عبادي كلكم عار إلا من كسوته فاستكسوني أكسكم، يا عبادي إنكم تخطئون بالليل والنهار وأنا أغفر الذنوب جميعاً فاستغفروني أغفر لكم، يا عبادي إنكم لن تبلغوا ضري فتضروني، ولن تبلغوا نفعي فتنفعوني، يا عبادي لو أن أولكم وآخركم وإنسكم وجنكم كانوا على أتقى قلب رجل واحد منكم ما زاد ذلك في ملكي شيئاً، يا عبادي لو أن أولكم وآخركم وإنسكم وجنكم كانوا على أفجر قلب رجل واحد منكم ما نقص ذلك من ملكي شيئاً، يا عبادي لو أن أولكم وآخركم وإنسكم وجنكم قاموا في صعيد واحد فسألوني فأعطيت كل واحد مسألته ما نقص ذلك مما عندي إلا كما ينقص المخيط إذا أدخل البحر، يا عبادي إنما هي أعمالكم أحصيها لكم ثم أوفيكم إياها، فمن وجد خيراً فليحمد الله، ومن وجد غير ذلك فلا يلومن إلا نفسه".(١)

**واته: ئەبو ذەری غیفاری(ڕەزای خوای لێ بێت) دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەری خواوە (ﷺ) کە خوای گەورە فەرمویەتی: ئەی بەندەکانم من زوڵم کردنم حەرام کردووە لەسەر خۆم، وە لە نێوان ئێوەشدا حەرامم کردووە، دەی کەواتە زوڵم لە یەکتر مەکەن.**

**ئەی بەندەکانم هەمووتان گومڕان مەگەر کەسانێك کە خۆم هیدایەتم دابن، دەی کەواتە داوای هیدایەت تەنها لە من بکەن منیش هیدایەتتان دەدەم.**

---

(١) مسلم برقم ٢٥٧٧ وغيره.

ئەی بەندەکانم هەمووتان برسین مەگەر کەسانێك کە خۆم خواردنم پێ دابێت دەی کەواتە لە من داوای خواردن بکەن منیش خواردنتان پێ دەدەم.
ئەی بەندەکانم هەمووتان ناپۆشتەو ڕووتن مەگەر کەسانێك کە خۆم پۆشتەم کردبن، دە داوای پۆشتەیی لە من بکەن منیش پۆشتەتان دەکەم.
ئەی بەندەکانم ئێوە بە شەوو بە ڕۆژ هەڵە دەکەن تەنها خۆم لە هەموو گوناهەکانتان دەبوورم، دەی کەواتە داوای داپۆشینی گوناهەکانتان تەنها لە من بکەن وە منیش گوناهەکانتان دادەپۆشم.
ئەی بەندەکانم ئێوە هەرگیز ناتوانن بگەنە زەرەری من هەتا زەرەم پێ بگەیەنن، وە هەرگیز ناتوانن بگەنە سوودی منم هەتا سوودم پێ بگەیەنن.
ئەی بەندەکانم ئەگەر یەکەم کەس و کۆتا کەستان، وە ئینسان و جنۆکەتان، حاڵیان وەك دڵی ئەوەتان بێت کە لە هەمووتان زیاتر لە خودا دەترسێت، ئەوە هیچ لە موڵکی من زیاد ناکات.
ئەی بەندەکانم ئەگەر یەکەم کەس و کۆتا کەستان، ئینسان و جنۆکەتان حاڵیان وەك دڵی ئەوەتان بێت کە لە هەمووتان زیاتر بەدکارو خراپەکارە ئەوە هیچ لە موڵکی من کەم ناکات.
ئەی بەندەکانم ئەگەر یەکەم کەس و کۆتا کەستان، ئینسان و جنۆکەتان لە دەشتێکدا بن ئینجا هەریەکە داوای هەرچی‌یەکم لێ بکات هەر کەسە یەکسەر داواکاری‌یەکەی خۆی پێ دەدەم و ئەوەش هیچ لەوە کەم ناکات کە لە لامە، وەك ئەوە وایە کە دەرزی‌یەك بکرێت بە دەریاکانداو دەربهێنرێتەوە.
ئەی بەندەکانم ئەوە تەنها کردەوەکانی خۆتانە بۆتانی ژمێرە دەکەم و بە تەواوی دەیدەمەوە بە خۆتان، جا هەر کەس پاداشتێکی باشی دەستکەوت با ستایشی خوای گەورە بکات و هەرکەسێکیش جگە لەمەی دەستکەوت با جگە لە خۆی لۆمەی هیچ کەس نەکات.

وە ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت کە سەراپا دروستکراوان هەژارو موحتاجی خوای گەورەن لە بەخشینی بەرژەوەندییەکانیان و لابردن و دوورخستنەوەی زیانەکان لە سەریان. لە هەموو لایەنەکانی دین و دونیایاندا. وە بەندەکان هیچ شتێك لەمانەیان بەدەست نییە بۆ خۆیان بەدی بێنن، وە ئەو کەسەی خوای گەورە فەزڵی نەدابێت بەسەریدا لە هیدایەتدان و ڕۆزی بەخشین، ئەوا لە دونیادا مەحروم دەبێت لێی، وە هەرکەسێك خوای گەورە فەزڵی نەدابێت بەسەریدا بە لێخۆشبوونی گوناهی ئەوا تاوانەکانی لە قیامەتدا تیای دەبات.[1]

## باسی دووەم: گرنگترین ئەو شتانەی کە پێویستە بەندە لە خوای خۆی داوا بکات:

پێویستە بەندە هەموو پێویستییەکی دین و دونیای تەنها لە خوای گەورە داوا بکات، چونکە هەموو خەزێنەکان بەدەستی ئەوە(سبحانه وتعالى)، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وإنْ من شيءٍ إلا عندَنا خزآئِنُهُ وما نُنَزِّلهُ إلا بقدَرٍ مَّعلومٍ﴾.[2]

واتە: هیچ شتێك نی یە (لە بەهرەو نازو نیعمەتەکان) کە گەنجینەکانی لای ئێمە نەبێت، وە ئێمە نایبەخشین بەئەندازەی دیاریکراو لە کاتی لەباردا نەبێت.

وە تەنها ئەوە کە ڕێگر نییە لەو شتەی کە دەیبەخشێت و بەخشەر نییە بۆ ئەو شتەی ئەو دەیگرێتەوە. هەروەك پێغەمبەری خوا(ﷺ) دەیفەرموو: "اللهم لا مانع لما أعطيت ولا معطي لما منعت ولا ينفع ذا الجدِّ منك الجدُّ".[1]

واتە: هیچ کەسێکی دەوڵەمەندو خاوەن سامان دەوڵەمەندییەکەی سوودی پێ ناگەیەنێت لە تۆ، بەڵکو ئیمان و گوێڕایەڵی سوودی پێ دەگەیەنێت.[2]

---

(١) جامع العلوم والحكم لابن رجب رحمه الله ٢/٣٧.

(٢) سورة الحجر، الآية: ٢١.

(٤) أخرجه مسلم ١/٤١٥.

(٢) النهاية في غريب الحديث لابن الأثير ١/٢٤٤.

وه خـوای گـهوره پێـی خۆشـه بهنـدهكانی داوای سـهرجهم بهرژهوهندیـیـهكانی دین ودونیایانی لێ بكهن له خواردن و خواردنهوهكان، ههروهك داوای هیدایـهت و لێخۆشـبوون و لێبـوردن و لـهش سـاغی و بـێ وهیـی لێ بكـهن[3] لـه دونیـاو قیامهتـدا، خـوای گـهوره دهفـهرموێت: ﴿....وسئَلُواْ اللهَ من فضلِهِ إنَّ اللهَ كانَ بكلِّ شيءٍ عليماً﴾.[4]

واتـه: ههمیشـه و بـهردهوامیش داوای زیـاده بهخشـش و بـههرهی خـوا بكـهن، چونكه بهڕاستی خوا بهههموو شتێك زانایه.

وعن أبي مسعود البدري(رضي الله عنه) قال: قال رسول الله(ﷺ): "سلوا الله من فضله فإن الله يحب أن يُسأل وأفضل العبادة انتظار الفرج".[5]

واتـه: خـوای گـهوره لـه فـهزڵی داوا بكـهن، چـونكه خـوای گـهوره پێـی خۆشـه داوای لێ بكرێـت، وه چاكترین پهرسـتش بـه ئارامگریـیـهوه چاوهڕوان كردنـی دهروو لێ كرانهوهیه.

وعن أنس بن مالك(رضي الله عنه) قال: قال رسول الله(ﷺ): "ليسأل أحدكم ربَّه حاجتهُ كلَّها حتى يسأل شِسْعَ نعْلِهِ إذا انقطع".[1]

---

(٣) بڕوانه: جامع العلوم والحكم لابن رجب ٢/٣٨-٤٠.

(٤) سورة النساء، الآية: ٣٢.

(٥) الترمذي برقم ٣٥٧١ في الدعوات، باب رقم ١١٦، وحسنه الشيخ عبد القادر الأرناؤوط في تحقيقه لجامع الأصول ٤/١٦٦.[بـهڵام شـێخی ئـهلبانی(ڕهحمـهتی خوای لێ بێت) فهرمویـهتی: (ضعیف جداً). بڕوانـه ضعیف الترغيب والترهيب١/٢٥٤ به ژماره(١٠١٥)-وهرگێڕ-].

(١) أخرجه الترمذي، ولـم أجده في نسـختي قال عبـد القـادر الأرناؤوط في تحقيقه لجامع الأصول ٤/١٦٦: "أخرجه الترمذي رقم ٣٦٠٧، ٣٦٠٨ في الدعوات، باب ١٤٩، وحسنه الترمذي وهو كما قال".[ بهڵام شێخی ئهلبانی(ڕهحمهتی خوای لێ بێت) سهرهتا به حهسهنی دانابوو، دواتر لێی پهشیمان بۆتهوهو فهرمویهتی: (ضَعیف) بڕوانه سلسلة الأحاديث الضعيفة به ژماره(١٣٦٢) -وهرگێڕ-].

واتـه: بـا هـەر یـەکێك لـە ئێـوە داوای سـەرجەم پێویسـتیيەکانی لـە خـوای پـەروەردگاری خـۆی بکـات، هـەتا بـەجۆرێك داوای چـاك بوونـەوەی قـەیتانی نەعلەکانیشی لێ بکات کاتێ چڕا.

بـەڵام پێویسـتە بەنـدە گرنگیيـەکی زۆر گـەورە بـدات بـەو لایەنـە گـرنگ و پێویسـتیيانەی کـە کامـەرانی ڕاسـتەقینەی تێدایـە، وە لـە گـرنگترین ئـەو لایەنانەش ئەمانەن:

١ - داوای هیدایـەت و ڕێنمونی لـە خـوای گـەورە بکـات، چونکە خـوای گـەورە دەفەرموێت: ﴿....مَن يَهْدِ اللَّهُ فَهُوَ الْمُهْتَدِ وَمَن يُضْلِلْ فَلَن تَجِدَ لَهُ وَلِيًّا مُّرْشِدًا﴾.(٢)

واتـه: ئـەوەی خـوا هیدایـەتی بـدات هـەر ئـەو هیدایـەت دراوەو ڕێنمـوویی وەرگرتـووە، ئـەوەش خـوا گـومڕای بکـات، ئـەوە هـەرگیز کەسـێکت دەسـت ناکەوێت کە پشتیوانی بکات و ڕێنموویی بکات.

جـا ڕێنـونی کـردنیش دوو جـۆرە: هیدایـەتێکی بـەکورتی(مُجمَـل) ئـەویش هیدایـەتی ئیمـان و ئیسـلامە کـە ئەمـەش بـۆ ئیمانـدارە، وە هیدایـەتێکی بـە درێژی(مُفَصَّل) ئەویش هیدایەتێتی بۆ زانینی تەفصیلاتی بەشـەکانی ئیمـان و ئیسلام و یارمەتی دانی بۆ ئەنجامدانی ئەمانە، ئەمـەش هـەموو ئیمانـدارێك لـە شـەوو ڕۆژدا پێویسـتی پێيـەتی، هـەر لەبـەر ئەوەشـە خـوای گـەورە فـەرمانی کردووە بە بەندەکانی لە هەموو ڕکاتێکی نوێژەکانیاندا بڵێن: ﴿إيَّاكَ نعبُدُ وإيَّاكَ نستَعينُ﴾.(١)

واتە: خوایە، تەنها هەر تۆ دەپەرستین و هەر لەتۆش داوای یارمەتی و پشتیوانی دەکەین (لە کاروباری دین و دنیاماندا، بەکەسی تر لە بەندەکانت ناکرێت).

---

(٢) سورة الكهف، الآية: ١٧.

(١) سورة الفاتحة، الآية: ٦.

وه پێغەمبـــەری خـــوا(ﷺ) لـــە پاڕانـــەوەی ئیســـتیفتاحی شـــەو نوێژیـــدا دەیفەرموو:"... اهدني لما اختلف فيه من الحق بإذنك إنك تهدي من تشاء إلى صراط مستقيم".[2]

وه وەسـێتی معـاذی کـوڕی جەبـەل(ڕەزای خـوای لێ بێـت)ی کـرد کـە دوای هـەموو نوێژێك بڵێت: "اللهم أعني على ذكرك وشكرك وحسن عبادتك".[3]

وه لەو لەو دوعایانەی کە لە ئیستفتاحی شەو نوێژیدا دەیفەرموو:"... اهدني لأحسن الأخلاق لا يهدي لأحسنها إلا أنت، واصرف عني سيِّئها لا يصرف عني سيئها إلا أنت".[4]

وه پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرمانی کرد بە عەلی کوڕی أبي طالب (ڕەزای خـوای لێ بێـت) کـە داوای ڕێنمـویی و تەوفیقـدان و لەسـەر سـەر سـوننەت بـوون و هـەق پێکـان(الهـدى والسـداد) لـە خـوای گـەورە بکـات: "اللهـم إنـي أسـألك الهُـدى والسداد".[5]

وه پێغەمبەری خوا(ﷺ) حەسەنی کـوڕی عـەلی (ڕەزای خوایان لێ بێت) فێـر کـرد کە لە قنوتی ویتردا بڵێت: "اللهم اهدني فيمن هديت".[6]

٢ ـ داواکردن لە خوای گەورە بۆ سڕینەوەی گوناهـەکان، چونکە لـە گـرنگترین ئـەو شـتانەی کـە پێویسـتە بەنـدە لـە پـەروەردگاری داوا بکـات لێبـوردنی

---

(٢) مسلم ١/٥٣٤، برقم ٧٧٠.

(٣) أبو داود ٢/٨٦، والنسائي ٣/٥٣ وصححه الألباني في صحيح أبي داود ١/٢٨٤.

(٤) مسلم ١/٥٣٤، برقم ٧٧١.

(٥) مسلم ٤/٢٠٩ برقم ٢٧٢٥.

(٦) أخرجه أصحاب السنن، وصححه الألباني في إرواء الغليل ٢/١٧٢، وفي صحيح سنن الترمذي ١/١٤٤، وفي صحيح ابن ماجه ١/١٩٤.

**گوناهـەکانێتی یـان ئـەو دوعایانـەی ئەمـە دەگرێتـەوە: وەك ڕزگـارکردنی لـە ئاگری دۆزەخ و خستنێیە بەهەشتەوە.**[1]

**وە بەندەش موحتـاجی ئەوەیـە کە خـوای گـەورە لـە گوناهـەکانی خـۆش بێـت، چـونکە بـەردەوام لـە شـەوو ڕۆژی‌ـدا گونـاه ئـەنجام دەدات و تـەنها خـوای گـەورەش لـە هـەموو گوناهـەکان خـۆش دەبێـت، لەبـەر گـەورەیی ئەمـەش پێغەمبەری خوا(ﷺ) دەفەرموێت:** "يا أيها الناس توبوا إلى الله فإني أتوب في اليوم إليه مائة مرة".[2]

**واتە: ئەی خەڵکینە بگەڕێنەوە بۆ لای خوای گەورە. بە ڕاستی من لە ڕۆژێك دا (سەد)جار تەوبە دەکەم و دەگەڕێمەوە بۆلای.**

وعن ابن عمر(رضي الله عنهما) قال: إن كنَّا لنعدُّ لرسول الله(ﷺ) في المجلس الواحد مائة مرة يقول: "ربِّ اغفر لي وتب عليَّ إنك أنت التوابُ الرحيم".[3]

لفظ الترمذي ورواية عند الإمام أحمد: "رب اغفر لي وتب عليَّ إنك أنت التواب الغفور".[4]

**واتـە: ئێمـە دەمانـژمارد پێغەمبـەری خـوا(ρ) پـێش ئـەوەی هەسـتێ لـە مەجلیسێکدا (سـەد) جـار دەیفـەرموو:** (ربِّ اغفر لي وتب عليَّ إنك أنت التوابُ الرحيم).

وقال(ﷺ): "من قال أستغفر الله العظيم الذي لا إله إلا هو الحي القيوم وأتوب إليه غفر الله له وإن كان فرَّ من الزحف".[1]

---

(١) جامع العلوم والحكم ٢/٤١، ٤٠٤.

(٢) مسلم ٤/٢٠٧٦.

(٣) أبو داود برقم ١٥١٦، وابن ماجه برقم ٣٨١٤، وصححه الألباني في صحيح أبي داود ١/٢٨٣، وصحيح ابن ماجه ٢/٣٢١، وأخرجه أحمد بهذا اللفظ أيضاً ١/٢١.

(٤) الترمذي برقم ٣٤٤٤ وأحمد بلفظ الترمذي إلا أنه قال بالشك "التواب الرحيم أو التواب الغفور" ١/٦٧.

واته: هەرکەسێك بڵێت: (أستغفر الله العظيم الذي لا إله إلا هو الحي القيوم وأتوب إليه) ئەوا خوای گەورە لە گوناهەکانی خۆش دەبێت ئەگەر چی لە جیهادیش ڕای کردبێت و پشتی هەڵکردبێت.

وە خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَمَن يَعْمَلْ سُوءًا أَوْ يَظْلِمْ نَفْسَهُ ثُمَّ يَسْتَغْفِرِ اللَّهَ يَجِدِ اللَّهَ غَفُورًا رَّحِيمًا﴾.[٢]

واتە: ئەوەی خراپەیەك بکات (دژ بەخەڵکی) یان ستەم لە خۆی بکات پاشان لەوەودوا (بەخۆیدا بچێتەوە) و داوای لێخۆشبوون لە خوا بکات، ئەوە خوایەکی لێخۆشبوو و میهرەبانی دەستدەکەوێت.

وە دەفەرموێت: ﴿وَإِنِّي لَغَفَّارٌ لِّمَن تَابَ وَآمَنَ وَعَمِلَ صَالِحًا ثُمَّ اهْتَدَى﴾.[٣]

واتە: دڵنیاش بن بەڕاستی من زۆر لێخۆش بووم لە کەسەی کە تەوبە دەکات و باوەڕ دەهێنێت و کاروکردەوەی چاکە دەکات، لەوەودوا (تا دوا هەناسەی ژیانی) بەردەوام دەبێت لەسەر ئەو ڕێبازە.

وعن أنس(رضي الله عنه) قال: سمعت رسول الله(ﷺ) يقول: " قال الله تعالى: يا ابن آدم إنك ما دعوتني ورجوتني غفرت لك على ما كان فيك ولا أبالي، يا ابن آدم لو بلغت ذنوبك عَنَانَ السماء ثم استغفرتني غفرت لك ولا أبالي، يا ابن آدم لو أتيتني بقراب الأرض خطايا ثم لقيتني لا تشرك بي شيئاً لأتيتك بقرابها مغفرة".[٤]

واتە: خوای گەورە دەفەرموێت: ئەی نەوەی ئادەم، تۆ هەتا ئەوە کاتەی لێم بپاڕێیتەوەو ئومێدت پێم هەبێت لێت دەبوورم ئەگەر چی هەرچی

(١) أبو داود ٨٥/٢ والترمذي واللفظ له ٥٦٩/٥ والحاكم وصححه ووافقه الذهبي ٥١١/١، وصححه الألباني في صحيح الترمذي ١٨٢/٣، وانظر: تحقيق الأرناؤوط لجامع الأصول ٣٨٩/٤.

(٢) سورة النساء، الآية: ١١٠.

(٣) سورة طه، الآية: ٨٢.

(٤) الترمذي ١٢٢/٤ والدارمي ٢٣٠/٢، وحسنه الألباني في صحيح الجامع ٥٤٨/٥، وانظر: تحفة الأحوذي ٥٢٥/٩ وجامع العلوم والحكم ٤٠٠/٢-٤١٨.

**گوناهێکیشت هەبێت و بە گەورەو گرانیشی نازانم. ئەی نەوەی ئادەم ئەگەر تاوانەکانت بگاتە ناو هەورەکانی ئاسمان و پاشان داوای لێخۆشبوونم لێ بکەیت، لێت دەبوورم و بە گەورەو گرانیشی نازانم. ئەی نەوەی ئادەم ئەگەر بە ئەندازەی پڕی زەوی تاوان و گوناهەوە بگەیتەوە پێم و هیچ هاوبەش و شەریکێکت بۆ دانەنابم، منیش بە ئەندازەی پڕ بە زەوی لێبوردنەوە پێت دەگەم.**

**وە زۆر جار ووشەی** (الإستغفار) **لەگەڵ ووشەی** (التوبة)**دا هاتووە، ئەو کات** (استغفار) **عیبارەتە لە داوای لێخۆشبوون کردن بە زوبان، وە** (التوبة)**ش عیبارەتە لە واز هێنان و دەستهەڵگرتن لە تاوان بە دڵ و ئەندامەکان، وە خوای گەورەش لە سورەتی** آل عمران **دا** [1] **پەیمانی لێخۆشبوونی داوە بەو کەسەی داوای لێخۆشبوون بکات لە تاوانەکانیو سوورو بەردەوام نەبێت لەسەر ئەوەی ئەنجامی داوە، کەواتە هەموو ئەو دەقانەی بە موطلەقی باسی لێخۆشبوون (استغفار) کردن دەکەن حەمل دەکرێنە سەر ئەم قەیدە، بەڵام داوای لێخۆشبوون کردن بە زوبان لەگەڵ سوور بوونی دڵ لەسەر تاوان ئەوە تەنها پاڕانەوەیەکی ڕووتە، ئەگەر خوای گەورە ویستی بێت وەڵامی دەداتەوەو ئەگەر ویستی بوو ڕەتی دەکاتەوە. وە دەشگونجێت سوور بوونی دڵ ببێتە ڕێگر لەبەر دەم وەڵامدانەوەی پاڕانەوەکەدا.** [2]

**عن عبد الله بن عمرو بن العاص(رضي الله عنهما) عن النبي(ﷺ) قال: "ارحموا تُرحموا، واغفروا يغفر الله لكم، ويل لأقماع القول[1] ويل للمصرين الذين يصرون على ما فعلوا وهم يعلمون".** [2]

---

(١) سورة آل عمران، الآية: ١٣٥.

(٢) جامع العلوم والحكم ٢/٤٠٧-٤١١.

**(١) واتە: کۆی (قَمع)ە وەك (ضَلَع)، ئەویش دەفرێکە بەکاتی لەسەر کوندەو جەوەنە دادەنرێت تا پڕ بکرێت لە خواردنەوەو ڕۆن، جا بیستنی ئەوانەی کە قسە دەبیستن و لێی تێ ناگەن و لەبەری ناکەن و کاری پێ**

واته: به زەییتان به یەکتردا بێتەوە خوای گەورە بەزەیی پێتاندا دێتەوە، لە خەڵکی ببورن خوای گەورە لێتان دەبورێت، وەیل بۆ ئەوانەی قسەی باش دەبیستن و کاری پێ ناکەن و لێی تێ ناگەن، وەیل بۆ بەردەوامان، ئەوانەی بەدەوامن لەسەر ئەو گوناهانەی کردویانەو دەشزانن.

وە ئەگەر کەسێك بڵێت: (أستغفر الله وأتوب) ئەوە دوو حاڵەتی هەیە:

**حاڵەتی یەکەم**: ئەوەیە ئەمە بڵێت و بە دڵیش سوورو بەردەوام بێت لەسەر سەرپێچی کردن، ئەو کاتە ئەم کەسە درۆزنە لە ووتەکەیدا کە دەڵێت: (وأتوب اليه)، چونکە تەوبەی نەکردووە، ئەو هەواڵی ئەوە دەدات کە تەوبەی کردووەو تەوبەشی نەکردووە.

**دووەمیش**: یان ئەوەتا بە دڵ وازی هێناوە لە سەرپێچی کردن، وە داوای تەوبەیەکی نەصوح لە خوای گەورە دەکات و پەیمان دەدات بە پەروەردگاری کە جارێکی تر ناگەڕێتەوە سەر سەرپێچی کردن، چونکە عەزم کردن لەسەر ئەوە واجبە لەسەری، جا ووتەی: (وأتوب اليه) هەواڵی ئەوە دەدات کە عەزمی لەسەر داوە لەو کاتەدا.(٣)

٣ . داوا کردنی بەهەشت لە خوای گەورەو پەنا گرتن پێی لە ئاگر: لەبەر فەرمودەکەی ئەبو هورەیرە(ڕەزای خوای لێ بێت) کە دەفەرموێت: پێغەمبەری خوا(ﷺ) بە پیاوێکی فەرموو: "ما تقول في الصلاة"؟ قال: أتشهد ثم أسأل الله

---

ناکەن شوبهاندووە بەو دەفرانەی هیچ حاڵی نابن چییان تێ دەکرێت و وەك ئەوە وایە بە مەجازی شتیان پێدا تێپەڕ بێت هەروەك چۆن خواردنەوە بە کاتی دەکرێتە ناوییەوەو دواتر ڕۆدەکرێتە شتی ترەوە.

(٢) أخرجه أحمد ١٦٥/٢، ٢١٩، ورواه البخاري في الأدب المفرد برقم ٣٨٠ وحسنه الحافظ ابن حجر في فتح الباري ١١٢/١، وصححه الألباني في صحيح الأدب المفرد ص١٥١، وفي سلسلة الأحاديث الصحيحة برقم ٤٨٢.

(٣) بڕوانە: جامع العلوم والحكم ٤١٠/٢-٤١٢.

الجنة، وأعوذ به من النار. أما والله ما أحسن دندنتك، ولا دندنة مُعاذ. فقال: "حولها ندندنُ"[(١)] يعني حول سؤال الجنة والنجاة من النار.

**واتـە: لـە نوێـژدا چـی دەڵێیـت؟ فـەرموی: تـەحییات دەخـوێنم و پاشـان داوای بەهەشت لە خوای گەورە دەکەم و پەنای پـێ دەگـرم لـە ئاگر. بـەڵام سوێند بـە خـوای گـەورە لـەو چـرپە چـرپـەی تـۆ و (مُعـاذ) نـازانم، پێغەمبـەری خـوا(ﷺ) فەرموی: ئێمەش هەر لە چواردەوری ئـەوە ئـەو چرپەچـرپە دەکـەین، (واتـە بـۆ داواکردنی بەهەشت و ڕزگار بوون لە ئاگر).**

وعن أنس بن مالك(رضي الله عنه) قال: قال رسول الله(ﷺ): "من سأل الله الجنة ثلاث مرات قالت الجنة: اللهم أدخله الجنة، ومن استجار من النار ثلاث مرات قالت النار: اللهم أجره من النار".[(٢)]

**واتە: هەرکەسێك سـێ جار داوای بەهەشت لـە خـوای گـەورە بکـات، بەهەشـت دەڵێت: خوایـە بیخـەرە بەهەشتـەوە، وە هـەرکەسێك سـێ جار پـەنا بگرێت بـە خوای گەورە لە ئاگر، ئاگر دەڵێت: خوایە پەنای بدە لە ئاگر.**

وعن ربيعة بن كعب الأسلمي(رضي الله عنه) قال: كنت أبيت مع رسول الله(ﷺ) فأتَيْتُهُ بِوَضُوئهِ وحاجته فقال لي: "سَلْ" فقلت: أسألك مرافقتك في الجنة. قال: "أو غير ذلك"؟ قلت: هو ذاك. قال: "فأعني على نفسك بكثرة السجود".[(٣)]

**واتە: من شەو لە خزمەت پێغەمبەری خوادا(ﷺ) دەماوە، جارێکیان ئاوی دەست نوێژ و دەست بە ئاو گەیاندیم بۆ هێنا ئـەویش فـەرموی: داوا بکـە، ووتم: داوای هاوڕێیەتی تۆت لێ دەکەم لە بەهەشتدا، فەرموی: ئەی شتێکی تـری غـەیری ئـەوە**

(١) أبو داود برقم ٧٩٢، ٧٩٣ عن جابر وبعض أصحاب النبي (ﷺ)، وابن ماجه عن أبي هريرة برقم ٩١٠ وصححه الألباني في صحيح أبي داود ١/١٥٠ وصحيح ابن ماجه ١/١٥٠.

(٢) الترمذي ٤/٧٠٠ وابن ماجه ٢/١٤٥٣، وغيرهما، وصححه الألباني في صحيح الترمذي ٢/٣١٩ وصحيح النسائي ٣/١١٢١.

(٣) مسلم ١/٣٥٣ برقم ٤٨٩.

نا بێـت؟ ووتم: هـەر ئـەوە، فـەرموی: دە کۆمـەکیم بکـە بـۆ نەفسـی خـۆت بـە زۆر سەجدە بردن.

وە ئەمەش بەڵگەیە لەسەر تـەواوی عـەقڵ و ژیـری رەبیعـە(ڕەزای خـوای لێ بێت)، وە بەڵگەیـە لەسـەر حـەز و هـەوڵی بـۆ بـەرزترین و گـەورەترین داواکـاری کـە هەمیشەییەو دەمێنێتەوە. پێغەمبەری خواش(ﷺ) ڕێنمایی کرد بۆ زۆر سەجدە بـردن، وە لەبـەر فەرمودەکـەی(ثَوبـان) (ڕەزای خـوای لێ بێـت) کـە بـە پێغەمبـەری خوا(ﷺ)ی فەرموو: أخبرني بعمل أعمله يدخلني الله به الجنة أو قال: بأحب الأعمال إلى الله فقال: "عليك بكثرة السجود، فإنك لا تسجد لله سجدة إلا رفعك الله بها درجة وحط عنك بها خطيئة".(١)

واتە: بە پێغەمبەری خوا(ﷺ)ی فەرموو: هەواڵم بدەرەیْ بە کردەوەیەك کە بیکـەم خـوای گـەورە بـە هۆیـەوە بمخاتـە بەهەشـتەوە، یـان فـەرموی: بـە خۆشەویسـترین کردەوە بە لای خوای گـەورە، پێغەمبـەری خـوا(ﷺ) فـەرموی: زۆر سـەجدە بـەرە، چونکە تۆ هیچ سەجدەیەك نابەیت بۆ خوای گەورە ئیلا خوای گـەورە بـە هۆیـەوە پلەیەك بەرزت دەکاتەوەو بە هۆیەوە گوناهێکت لەسەر دەسڕێتەوە.

٤ ـ داواکردنی لێبوردن و لـەش سـاغیو بـێ وەیـی لـە خـوای گـەورە لـە دونیـاو قیامەتدا: لەبەر فەرمودەکەی عەباسی کوڕی عبدالمطلب(ڕەزای خوای لێ بێت) کە دەفەرمویێت: قلت يا رسول الله علمني شيئاً أسأله الله ؟ قال: "سل الله العافية" فمكثت أياماً ثم جئت فقلت يا رسول الله علمني شيئاً أسأله الله ؟ فقال لي: "يا عباسُ، يا عمَّ رسول الله: سل الله العافية في الدنيا والآخرة".(٢)

واتە: ووتم: ئـەی پێغەمبـەری خـوا(ﷺ) شتێکم فێـر بکـە لـە خـوای گـەورە داوا بکـەم؟ فـەرموی: داوای بـێ وەیـی بکـە، چـەند ڕۆژێـك ڕابـوورد بەسـەرمداو

(١) مسلم ١/٣٥٣ برقم ٤٨٨.

(٢) الترمذي ٥/٥٣٤ برقم ٣٧٦١ وصححه الألباني في صحيح الترمذي ٣/١٧٠.

هاتمەوەو وتم: ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) شتێکم فێر بکە کە لە خوای گەورە داوای بکەم؟ ئەویش پێی فەرمووم: ئەی عەباس، ئەی مامی پێغەمبەری خوا(ﷺ)داوای سەلامەتیو بێ وەیی لە خوای گەورە بکە لە دونیاو قیامەتدا.

وە لەبەر فەرمودەکەی ئەبو بەکری الصدیق(ڕەزای خوای لێ بێت) کە دەفەرموێت:

أن النبي (ﷺ) قال على المنبر: "سلوا الله العفو والعافية، فإن أحداً لم يعط بعد اليقين خيراً من العافية".(١)

واتە: پێغەمبەری خوا(ﷺ) لەسەر میبنبەر فەرموی: داوای لێبوردن و بێ وەیی بکەن، چونکە هیچ کەسێك دوای یەقین شتێکی چاکتری بێ نەبەخشراوە لە سەلامەتی و بێ وەیی.

٥ . داوای دامەزراوی لەسەر دین و عاقیبەت باشی کردن لە خوای گەورە لە هەموو شتێکدا:

عبد الله بن عمرو بن العاص(رضي الله عنهما) سمع رسول الله(ﷺ) يقول: "إنَّ قلوب بني آدم كلها بين إصبعين من أصابع الرحمن كقلب واحد، يصرِّفه حيث شاء" ثم قال رسول الله(ﷺ): "اللهم مصرف القلوب صرِّف قلوبنا على طاعتك".(٢)

واتە: هەموو دڵەکانی نەوەی ئادەم لە نێوان دوو پەنجەدایە لە پەنجەکانی خوای بەبەزەیی هەر وەك یەك دڵ، چۆن ویستی لێ بێت وەری دەگێڕێت، پاشان پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرموی: خوایە ئەی وەرگێڕی دڵان دڵەکانمان وەرگێڕە بۆ سەر گوێڕایەڵی کردنت (و دامەزراوی بکە لەسەری).

وە فەرمودەکەی ئوم سەلەمە(ڕەزای خوای لێ بێت): کاتێ پرسیاری لێ کرا دەربارەی ئەوەی زۆرترین پاڕانەوەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) چی بووە کاتێ لای

---

(١) الترمذي برقم ٣٨١١ وحسنه الألباني في صحيح الترمذي ٣/١٨٠، وصحيح ابن ماجه برقم ٣٨٤٩. وللحديثين شواهد في مسند الإمام أحمد بترتيب أحمد شاكر ١/١٥٦-١٥٧. ومن حديث أنس بن مالك في الترمذي برقم ٣٨٤٦، وانظر: صحيح الترمذي ٣/١٧٠، ١٨٠، ١٨٥.

(٢) مسلم ٤/٢٠٤٥ برقم ٢٦٥٤.

ئەم بووە؟ فەرموی: كان أكثر دعائه: "يا مقلب القلوب ثبت قلبي على دينك". قالت: قلت: يا رسول الله مالِ أكثر دعائك: "يا مقلب القلوب ثبت قلبي على دينك"؟ قال: "يا أم سلمة، إنه ليس آدمي إلا وقلبه بين إصبعين من أصابع الله فمن شاء أقام، ومن شاء أزاغ".[(١)]

واتە: زۆرترین پاڕانەوەی بریتی بوو لە: "يا مقلب القلوب ثبت قلبي على دينك" واتە: ئەی وەرگێڕی دڵان دڵم دامەزراو بکە لەسەر دینەکەت، دەفەرموێت: وتم ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) بۆچی زۆربەی دوعاو پاڕانەوەت بریتی‌یە لەمە؟ فەرموی: ئەی ئوم سەلەمە، هیچ ئادەمیزادێك نی‌یە ئیلا دڵی لە نێوان دوو پەنجەدایە لە پەنجەکانی خوای گەورە، ویستی لە کێ بوو ڕاگرو چەسپاوی دەکات و ویست لە کێ بوو لە حەق لای دەدا.

وە فەرمودەکەی بسر ی کوڕی أرطأة(ڕەزای خوای لێ بێت) دەفەرموێت: سمعت رسول الله (ﷺ) يدعو: "اللهم أحسن عاقبتنا في الأمور كلها وأجرنا من خزي الدنيا وعذاب الآخرة".[(٢)]

واتە: گوێم لێ بوو پێغەمبەری خوا(ﷺ) دەپاڕایەوەو دەیفەرمو: "اللهم أحسن عاقبتنا في الأمور كلها وأجرنا من خزي الدنيا وعذاب الآخرة" واتە: خوایە عاقیبەتمان چاك بکەیت لە هەموو کاروبارەکانماندا و پەنامان بدە لە سەرشۆڕی‌و ڕیسوایی دونیاو سزای دوا ڕۆژ.

٦ ـ داواکردنی بەردەوام بوونی نیعمەت لە خوای گەورەو پەنا گرتن پێی لە نەمان و لە ناوچوونی: وە گەورەترین نیعمەتیش بریتی‌یە لە نیعمەتی دین.

---

(١) الترمذي ٢٣٨/٥، وأحمد ١٨٢/٤، والحاكم ٥٢٥/١ و٥٢٨ وصححه ووافقه الذهبي، وصححه الألباني في صحيح الترمذي ١٧١/٣.

(٢) أحمد ١٨١/٤ وعزاه الهيثمي في مجمع الزوائد ١٧٨/١٠ إلى الطبراني في الكبير وقال: رجال أحمد وأحد أسانيد الطبراني ثقات.

لەبەر فەرمودەکەی ئەبی هورەیرە(ڕەزای خوای لێ بێت) کە فەرمویـەتی: کان رسول الله (ﷺ) یقول: "اللهم أصلح لي ديني الذي هو عصمة أمري، وأصلح لي دنياي التي فيها معاشي، وأصلح لي آخرتي التي إليها معادي، واجعل الحياة زيادة لي في كل خير، واجعل الموت راحة لي من كل شر".(١)

واتە: پێغەمبەری خوا(ﷺ) دەیفەرموو: خوایە ئەو دینداریـەم بۆ چاك بکـەیت کە پارێزەری کاروبارمە، وە دونیام بۆ چاك بکەی کە ژیان و بژێویمی تێدایـە، وە دوا ڕۆژم بۆ چاك بکەیت کە گەڕانەوەم بۆ ئەوێیە، وە ژیـانم بکەیتـە مایـەی زیاد بوونی هەموو چاکەیەك و مـردنیش بکەیتـە ئیسـراحەت کـردنم لـە هـەموو خراپەیەك.

وعن عبد الله ابن عمر(رضي الله عنهما) قال: كان من دعاء رسول الله(ﷺ): "اللهم إني أعوذ بك من زوال نعمتك، وتحول عافيتك، وفجاءة نقمتك، وجميع سخطك".(٢)

واتە: لە پاڕانەوەکانی پێغەمبەری خـوا(ﷺ) بریتـی بـوو لـە: خوایـە مـن پـەنات پێ ئەگرم لە نەمان و ڕۆیشتنی نیعمەتت لەسەرم، وە گۆڕانی ئەو لـەش سـاغی و بـێ وەیییـەی پێـت داوم. وە سـزای کتـوپڕت وە لـە هـەموو خەشـم و توڕەبونەکانت (و هەر هۆکارێك ببێتە مایەی توڕە بوونت).

٧ . پەنا گرتن بە خوای گەورە لـە بـەڵای بڕست بڕ و گەیشتن بـە شـەقاوەتی و خراپەی قەزاو پێخۆشبوونی دوژمنان:

---

(١) مسلم ٤/٢٠٨٧ برقم ٢٧٢٠.

(٢) مسلم ٤/٢٠٩٧ برقم ٢٧٣٩.

لەبەر فەرمودەکەی ئەبی هورەیرە(ڕەزای خوای لێ بێت): أن النبي (ﷺ): "كان يتعوذ من سوء القضاء، ومن درك الشقاء، ومن شماتة الأعداء، ومن جهد البلاء".[1]

واتە: پێغەمبەری خوا(ﷺ) پەنای دەگرت بە خوای گەورە لە خراپەی قەزاو گەیشتن بە شەقاوەت و پێخۆشبوونی دوژمن و لە نارەحەتی و ماندوێتیو بەلاّی بڕست بڕ (یان کەمی سامان و زۆری خێزان).

ئەمانە چەند نمونەیەك بوون لە گرنگترین ئەو داواکارییانەی پێویستە بەندە لێی بێ ئاگا نەبێت، لە هەمان کاتیشدا پێویستیشە لەسەری بێ ئاگا نەبێت لە پاڕانەوەی بۆ چاك بوون و ئیصلاحی خۆی و نەوەکانی و سەرجەم موسڵمانان.

وصلى الله وسلم وبارك على سيدنا محمد وعلى آله وصحبه ومن تبعهم بإحسان إلى يوم الدين.

(١) مسلم ٤/٢٠٨٠ برقم ٢٧٠٧.